هەرێمی کوردستانی عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئـەدەبی کـوردی

## پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

پێداچوونەوەی زانستی و بژارکردنی دووەم بۆ هەرچوار بەش

سادق ئەحمەد ڕوستایی | نەمام جەلال ڕەشید | ئەختەر سدیق حسین
سۆزان عەلی محەمەد | محسن عەلی حسین | حسین صابر عەلی

چاپی هەشتەم | ٢٠١٥زایینی | ٢٧١٥کوردی

# پێشەکی

وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق، لیژنەیەکی بۆ بژارکردنو پێداچوونەوەی زانستی پەرتوکی (زمانو ئەدەبی کوردی) بۆ پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی پێکهێنا. لیژنەکە دەستیکرد بە پێداچوونەوەی هەموو بەشەکانی پەرتوکەکەو بەپێی پێویست وشەو ڕستەی لە هەردوو زاری (کرمانجی سەروو، کرمانجی خواروو)ی زمانی کوردی بۆ قوتابییان هێناوەتەوە. ئەمەش بەو مەبەستەیە کە زمانی کوردی لە بنچینەدا یەك زمانەو ئەو جیاوازییەی لەنێوان زارەکانیدا هەیە ئەوە نییە کە ببێتە جێی مەترسی.

پەرتوکەکە لە چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە (ڕێزمان، ڕێنووس، ئەدەب، خوێندنەوە)، بەشی ڕێزمان لە هەژدە بابەتی جیاواز پێکهاتووە، داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەین کە بایەخێکی زۆر بە چۆنییەتی گوتنەوەو خستنەڕووی ئەم بەشە بدەن، نمونە لە هەردوو زارەکە بخەنە بەردەم قوتابییانو داوایان لێ بکەن کە تەنیا پشت بە نمونەو ڕستەکانی ئەم پەرتوکە نەبەستن. مامۆستای بەڕێزیش بەپێی پێویست دەتوانێت چەند تێبینییەکی زیاتر لەسەر بابەتەکان بخاتەڕوو. هەروەها بەشی ڕێنووس تایبەتە بە نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی.

بەشی ئەدەب تایبەتە بە ژیانو بەرهەمی چەند شاعیرو نووسەرێك. داوا لە مامۆستایان دەکەین لە ڕووی ڕوخسارو ناوەرۆکەوە بەپێی پێویست بابەتەکان بۆ قوتابیان ڕوونبکەنەوەو داوایان لێ بکەن (سێ) دێر هۆنراوە، لە نمونەی هەر شاعیرێك ئەزبەر بکەن. نمونەی پەخشانیش دەخوێندرێتەوەو گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، بەڵام ئەزبەر ناکرێت.

لە بەشی خوێندنەوەدا بابەتەکان لەلایەن قوتابییان بخوێندرێتەوە، پاشان باس لە واتای وشەو دەستەواژەکان بکرێت. ئینجا لەنێوان مامۆستاو قوتابییان گفتوگۆیەکی کراوە لەسەر ناوەرۆکی بابەتەکە ئەنجامبدرێت.

بێگومان هیچ کارێك بێ کەموکورتی نابێت، داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەین لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگاکانیان لە کەموکورتی کتێبەکەو تێبینیو پێشنیازەکانیان ئاگادارمان بکەنەوە.

**لەگەڵ ڕێزماندا.**

**لیژنەی بژارکردنو پێداچوونەوەی زانستی**

**٢٠١٥/٢/١٧**

# بەشی ڕێزمان

١. کەرستەکانی زمان
٢. دەنگەکانی زمان و پیتەکانی وشە
٣. شێوەکانی وشە
٤. برگەکانی پەیڤ (وشە)
٥. جیاوازی نێوان ڕستەو گرێ
٦. جۆرەکانی ڕستە (ڕستە بە پێی ناوەڕۆك)
٧. ڕستەی ڕاگەیاندن: ئـ- ڕستەی ئەرێ ب- ڕستەی نەرێ
٨. ڕستەی پرس
٩. ڕستەی سەرسوڕمان
١٠. بنچینەکانی ڕستە:
ئـ- (بکەر) کاری تەواو ب- (نیهاد) کاری ناتەواو
١١. کار: ئـ- کاری تەواو ب- کاری ناتەواو
١٢. دیارخەری ناو- تەواوکەری کار
١٣. ناو
١٤. جۆرەکانی ناو:
ئـ- ناو لەڕووی ناوەڕۆکەوە ناوی (تایبەتی، گشتی، کۆمەڵ)
ب- ناو لەڕووی هەبوونەوە ناوی (بەرجەستەو واتایی)
١٥. ئەرکی ناو لەڕستەدا:
١٦. جێناوی کەسی سەربەخۆ:
(ئـ) جێناوی کەسی سەربەخۆ
(ب) جێناوی کەسی سەربەخۆ
(پ) جێناوی کەسی سەربەخۆ
١٧. چاوگ
١٨. کار لەڕووی دەم و کاتەوە:
ئـ. کاری ڕابردوو (بۆری)
ب. کاری ڕانەبردوو
پ. کاری داخوازی

(وانەی یەکەم)

# کەرستەکانی زمان

| -ئـ- | نمونە | -ب- | نمونە |
|---|---|---|---|
| پیت | هـ - ە- نـ- ا – ر | ڕستە | ئاڵای کوردستان شەکاوەیە. |
| ↓ | | ↓ | |
| بڕگە | هـە/نار | گرێ | ئاڵای کوردستان |
| ↓ | | ↓ | |
| وشە | هەنار | وشە | ئاڵا |
| ↓ | | ↓ | |
| گرێ | هەناری شیرین | بڕگە | ئا/ڵا |
| ↓ | | ↓ | |
| ڕستە | هەناری شیرین خۆشە. | پیت | ئـ - ا- ڵـ- ا |

لە ساڵانی پێشوودا کەرستەکانی زمانتان خوێندووە، ئەویش لە بچوکترین کەرستەوە کە (پیت)ە، ئینجا بە لێکدانی دوو پیت یان زیاتر (بڕگە)تان دروستکردووە، پاشان لە بڕگەکانیش (وشە)تان دروستکردووەو دوو وشە یان زیاتریشتان داوەتە پاڵ یەکترو (گرێ)تان دروستکردووە، ئەمانەشتان بە چەند قۆناغێکی یەکبەدوای یەکدا خوێندووە تا وەکو توانیوتانە (ڕستە)ش دروست بکەن، هەر وەك لە خشتەی ( ئـ)دا بە ئاشکرا لە بچوکترین کەرستەوە بۆ گەورەترین کەرستەی زمان فێرکراون، بەڵام قوتابی خۆشەویست، لەم ساڵەدا بە شێوەیەکی دیکە بە بابەتەکەدا دەچینەوە، کە لە گەورەترین کەرستەی زمانەوە بۆ بچوکترین کەرستە دووبارە دەیانخوێنینەوە، هەر وەك لە خشتەی (ب)دا بە ئاشکرا دیارە.

# ڕاهێنان

## (گرێ، پیت، وشە، ڕستە، بڕگە)

١. ئەم کەرستانە لە بچوکترین بۆ گەورەترین کەرستە ڕیزبکە.

٢. بچوکترین کەرستەی زمان چییە؟

٣. لە پیت گەورەتر چییە؟

٤. لە (بڕگە) گەورەتر چییە؟

٥. دوو وشە بەهۆی ئامرازی (ی)یەوە بدرێنە پاڵ یەکتر چی دروستدەبێت؟

٦. گەورەترین کەرستەی زمان چییە؟

٧. ئەمجارە کەرستەکانی زمان لە گەورەترین کەرستە بۆ بچوکترینیان ڕیز بکە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتاکەی |
|---|---|
| وشە | پەیڤ |
| خۆشەویست | خۆشتڤی |
| گەورە | مەزن |
| بچوک | بچیك |
| ئەمجارە | ڤی جارەی |
| پاڵ یەکتر | رەخ ئێك |

(وانەی دووەم)

# دەنگەکانی زمانو (پیتەکانی وشە)

١. **داری ئازادی بە خوێن ئاودەدرێ.**

٢. **سیروان ڕوبارێکی کوردستانە.**

٣. **برا لە پشت برا بێت، مەگەر قەزا لەلای خودا بێت.**

٤. **کۆمەڵە شاخێك سەختو گەردن کەش**

**ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش**

ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم ڕستانە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت، کە هەر یەکەیان لە چەند وشەیەك پێکهاتووە، کە بەشێوەیەکی تایبەت ڕیزکراونو دراونەتە پاڵ یەکترو واتاو مەبەستێکی تەواو دەبەخشن، وشەکانی ئەم نمونانە هەر یەکەیان لە برگەیەك یان چەند برگەیەك پێکهاتوون، برگەش بەهیچ شێوەیەك بەبێ بزوێن نابێت.

ئەگەر ئەو برگانە زیاتر شیبکەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە هەر برگەیەك لە چەند دەنگە زمانێك پێکهاتوون، بۆ نمونە برگەی (دا) لە هەردوو دەنگی (د) و (ا) پێکهاتووە، کە هەر یەکەیان دەنگێکە لە دەنگەکانی زمانی ئادەمیزادو بەم پێیە هەموو زمانێك کۆمەڵە دەنگێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە بە هۆیانەوە وشەو ڕستەکان دروست دەکرێنو دەبنە مایەی گفتوگۆو ئاخاوتن لە نێوان کەسانی سەر بە یەك زماندا، ئەو دەنگانەش دیارە هەر یەکەیان

شێوەی دەربڕینو هاتنە دەرەوەیان لە ئەندامەکانی ئاخاوتن، (قورگ، زمان، ددان، لێو،... هتد) هەر یەکەیان بە گوێرەی خۆی بەشدار دەبێت. ئەو دەنگانەی کە تایبەتن بە زمانی کوردی بۆ هەر یەکەیان هێمایەك دانراوە کە بە (پیت) ناو دەبرێن، بۆ ئەوەی لە کاتی نووسیندا بناسرێنەوە، بۆ نمونە، دەنگی (ك) کاتێك لە دەم دێتە دەرەوە، تەنیا جۆرە ئاوازێکەو بە گوێ دەیبیستینو هەستی پێدەکەین.

هەر کۆمەڵە مرۆڤێك هاتووەو هێمایەکی بۆ داناوە، بۆ نمونە لەلای هەندێ لەو کۆمەڵە مرۆڤانە ئەم دەنگە بە هێمای (ك)و لەلای هەندێکی تریش بە هێمای (k)و لەلای خەڵکانی تریش بە هێمای جیاواز لەم دوو هێمایە دەستنیشانکراوە. ئەو هێمایەی کە بۆ هەر یەك لە دەنگەکانی زمان دانراوە لای ئێمە بە (پیت) ناو دەبرێت.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە پیت هێماو وێنەی ئەو دەنگانەیە، کە لە نووسیندا بەکاردێن، دەنگەکانی زمانیش هەیانە لە دەربڕیندا گرانو هەیانە ئاسانە. بەم شێوەیە دەتوانین دەنگەکانی زمانی کوردی کە ژمارەیان (٣٧)دەنگە، بکەین بە دوو کۆمەڵەوە.

١. **دەنگە نەبزوێنەکان:** هەموو ئەو دەنگانە دەگرێتەوە کە دەربڕینیان گرانەو بە یارمەتی دەنگە بزوێنەکانەوە لە دەم دێنە دەرەوە بۆ هەر یەکێك لەم دەنگانە وەك لەسەرەوە باسکرا، هێمایەکی تایبەت دانراوەو پێی دەگوترێت (پیت).

کەوابوو دەتوانین دەنگە نەبزوێنەکانی زمانی کوردی بەم شێوەیە بنووسین (ئـ، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ك، گ، ل، ڵ، م، ن، هـ ، و، ی) لێرەدا بۆمان دەرکەوت، کە ژمارەی ئەو دەنگانە (٢٩) دەنگەو بەو هێمایانەی کە بۆ هەر یەکێك لەو دەنگانە دانراوە دەگوترێ پیت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەزمانی کوردیدا (٢٩) پیتی نەبزوێن هەیە.

٢. **دەنگە بزوێنەکان:** هەموو ئەو دەنگانە دەگرێتەوە، کە بە ئاسانی لە دەم دێنە درەوەو یارمەتی دەنگە (نەبزوێن)ەکان دەدەن بۆ ئەوەی بە ئاسانی بێنە گوتنو دەربڕین. ئەم دەنگانەش هەر وەك دەنگەکانی کۆمەڵەی یەکەم بۆ هەر یەکەیان هێمایەك دانراوە، بۆ ئەوەی بنووسرێنو بخوێنرێنەوە، دەنگە بزوێنەکانیش ئەمانەن: (ا، ە ، و، ۆ، وو، ی، ێ، بزرۆکە(i)) بەو هێمایانەش کە بۆ هەر یەکێك لەو دەنگانە دانراوە، دەگوترێت (پیت)، ژمارەی ئەم دەنگانەش (٨) دەنگن و هەر دەنگە هێمای تایبەتی خۆی هەیە، وەك لەمەو پێش بەرچاومان کەوت، کەواتە بە هێمای نووسراوی ئەو دەنگانە دەڵێن: (پیتە بزوێن)ەکانی زمانی کوردی، لە پیتە بزوێنەکاندا بزوێنی کورتی ( i ) هەیە، کە بەم (ئەلفبێ)یەی ئێستا پێی دەنووسین هێمای تایبەتی خۆی بۆ دانەنراوە، وەك ئەو بزوێنە کە لەم وشانە (ژن، مـن، مـل، دڵ، شـل، کـل،.... )دا هەنو پیتە (بزرۆکە)کان کەوتۆنەتە نێوان هەردوو پیتە نەبزوێنەکانەوە، بەڵام دەرنەکەوتوون، چونکە هەر وەك ئاماژەمان پێدا ئەم بزوێنە لە نووسینی

(ئەلفبێ)یەی ئێستامان دەرناکەون، ئەگەر بە پیتی لاتینی بنووسرێت زۆر بە ئاشکرا دەردەکەوێت، وەك( jin, min, mil, dil, şil, kil,…) هەر لەبەر ئەوەی ئەم بزوێنە زۆر کورتەو هێمای تایبەتی خۆی نییە، بۆیە پێی دەگوترێت (بزرۆکە).

**تێبینی/** جیاکردنەوەی پیتی (و، ی)ی نەبزوێن لە پیتی (و، ی)ی بزوێن:

١. پیتی (و، ی)ی بزوێن هەرگیز لەسەرەتای وشەو بڕگەوە نایەنو ئەوەی لەم شوێنانەدا هات بێگومان پیتی (و، ی)ی نەبزوێنە، وەك (وەرزش، کاروان، یاری، بڕیار...).

٢. هەر کاتێك لە پێشو لەدوای پیتی (و، ی)یەوە پیتێکی بزوێن هەبێت، ئەوا ئەم (و، ی)یە بێگومان دەبنە پیتی نەبزوێن وەك (سێو، شێو، لاو لاو، تاو تاو،...).

٣. ئەگەر لە پێش یان لەدوای پیتی (و، ی)یەوە پیتێکی (نەبزوێن) هاتبێت ئەوا ئەم (و، ی)یە دەبنە پیتی (بزوێن) وەك (کورد، گوڵ، بڕین، فڕین...).

٤. هەرگیز لە زمانی کوردیدا دوو پیتی (بزوێن) بە دوای یەکدا نایەن.

## دەستور:

دەنگ: بچوکترین دانەی ئاخاوتنە، کە لە دەم دێتە دەرەوە.

پیت: ئەو هێما تایبەتانەن، کە بۆ هەر یەکێك لە دەنگەکانی ئاخاوتنی مرۆڤ دانراوە، واتا (پیتەکان وێنەی دەنگەکانن) پیتەکانیش بە گشتی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١. دەنگە نەبزوێنەکان: ئەو دەنگانەن کە لە دەربڕینو ئاخاوتندا گرانن و بە هۆی دەنگە بزوێنەکانەوە لە دەم دێنە دەرەوە. ژمارەی پیتە نەبزوێنەکان لە زمانی کوردیدا (٢٩) پیتە.

٢. دەنگە بزوێنەکان: ئەو دەنگانەن کە بە ئاسانی لە دەم دێنە دەرەوەو یارمەتی دەنگە نەبزوێنەکان دەدەن بۆ ئەوەی بە ئاسانی بێنە گوتن. ژمارەی پیتە بزوێنەکان لە زمانی کوردیدا (٨) دەنگن، کە لەناو خۆیاندا دەبن بە دوو جۆر:

ئ- دەنگە بزوێنە کورتەکان: (بزرۆکە(i)، ە، و، ی).

ب- دەنگە بزوێنە درێژەکان: (ا، ۆ، وو، ێ).

## ڕاهێنانی (١)

پیتە بزوێنو نەبزوێنەکان لەم وشانەدا دەربهێنە:

(گەڵا، کەیبانوو، بەڕوو، کارێز، دۆ، گڵەزەردە، هەنگ، کورد، گەنم، کەروێشك، کەوچك)

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. ژمارەی پیتەکانی زمانی کوردی (٣٧، ٣٩، ٢٩)

٢. لەم وشەیە پیتی بزرۆکە هەیە ( ئاڵا، چنار، کانی)

٣. ژمارەی پیتە بزوێنەکان (٧، ٨، ٩)

٤. ئەم وشەیە یەك بڕگەیەو یەك پیتی بزوێنی هەیە (سێ، بڕوا، بەهار)

## ڕاهێنانی (٣)

ئەمانەی خوارەوە ڕوونبکەرەوە:

١. ئایا دەگونجێت پیتی بزوێن بکەوێتە سەرەتای وشەو بڕگەوە؟

٢. ئایا لەزمانی کوردیدا دەگونجێت دوو پیتی بزوێن بە دوای یەکدابێن؟

٣. جیاوازی لە نێوان پیتی (یـ) سەرەتای وشەی (یاری)و پیتی (یـ) لە وشەی (میر)دا چییە؟ ڕوونی بکەوە.

٤. پیتی (و) لە دوو وشەدا بهێنەرەوە بە مەرجێك جارێك (بزوێن) و جارێك (نەبزوێن) بێت.

٥. دەگونجێت لە زمانی کوردی دوو پیتی نەبزوێن بەدوای یەکدا بێن.

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتاکەی |
| --- | --- |
| ئاخاوتن | ئاخافتن ، پەیڤین |
| بنووسرێنەوە | بهێتە نڤیسین |
| پێیدەگوترێت | دبێژنێ |
| بە ئاسانی | ب سانایی، ب ساناهی |
| ئێستا | نوکە، نهۆ، هەنوکە |
| ڕابردوو | بۆری |
| ڕانەبردوو | نەبۆری |
| بەوردی | ب هویری |
| دەنگ | پێکهاتەیەکە سروشتی بیستنی هەیەو هەرجارێك وەك خۆی دوبارە نابێتەوە. |
| پیت | شێوەی دەنگە |

(وانەی سێیەم)

# شێوەکانی وشە

-ئـ- وشەی سادە

-ب- وشەی ناسادە: ١ وشەی دارێژراو، ٢ وشەی لێکدراو

| وشەی سادە | وشەی دارێژراو | وشەی لێکدراو |
| --- | --- | --- |
| کورد | کوردستان | کوردزمان |
| داس | داسولکە | تەورداس |
| ڕەش | ڕەشکە | ڕەشماڵ |
| ڕۆژ | بەڕۆژ | ڕۆژهەڵات |
| دەم | بەدەم | گوڵ بەدەم |
| ئاسن | ئاسنگەر | سەرئاسن |
| چاو | چاویلکە | چاوکاڵ |
| دڵ | بەدڵ | دڵخۆش |
| دار | دارەوان | دارگوێز |
| کردن | کردنەوە | چاککردنەوە |
| کردن | هەڵکردن | دروستکردن |
| خستن | داخستنەوە | ڕێکخستنەوە |

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی ڕیزی (ئـ) دەبینین هەر یەکەیان شێوەیەکەو لە چەند پیتێکی ڕیزکراو پێکهاتووەو ئەم پیتانە بەسەر یەکەوە واتایەکی تەواویان دروستکردووەو بە هەر یەکێکیان دەگوترێ (وشە). ئەم وشانە زۆر سادەو ساکارن‌و هیچ زیادەیەك (پێشگر، پاشگر) نەچۆتە سەریان و تەنیا یەك مەبەستیان تێدا بەدی دەکرێ، بۆیە بە هەر یەکێك لەمانە دەگوترێ (وشەی سادە) و دەتوانین بە ئاسانی‌و بەپێی پێویست هەر یەکەیان لە ڕستەدا بەکاربهێنین، هەروەها ئەم جۆرە وشانە سادەن‌و بەشێکی زۆری وشەکانی دیکەی زمان لەمانەوە وەردەگرین.

ئەگەر بڕوانینە وشەکانی ڕیزی (ب) خاڵی (١) دەبینین هەر یەکەیان پێیان دەگوترێت (وشەی ناسادە)، کە ئەویش دەبێت بە دوو جۆر:

١- (وشەی داڕێژراو) ئەم جۆرەش لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشێکیان بنجی‌و واتادارەو ئەوی دیکەیان زیادەیەو بێ واتایەو بە هەردووکیان بەسەر یەکەوە وشەیەکی نوێیان بۆ واتایەکی نوێ دروستکردووەو داڕشتووە، بۆ نمونە وشەی (کوردستان) لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی (کورد) کە وشەیەکی سادەی واتادارەو سەربەخۆ دەتوانرێت لە ڕستەدا بەکاربێت‌و بەشی(ستان)، کە (پاشگر)ە خراوەتە دوای وشەی (کورد)ەوە بۆ ئەوەی هەردووکیان وشەیەکی نوێ لە واتاو مەبەستدا دروست بکەن. جگە لەوە وشەی (هەڵکردن)، دیسان لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی (کردن)، کە وشەیەکی بنجی سادەی واتادارەو سەربەخۆ دەتوانرێت لە ڕستەدا بەکاربێت‌و بەشی (هەڵ)، کە (پێشگر)ە خراوەتە پێش وشەی (کردن)و بە

## ڕەگـــــی کار

(١)

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
| --- | --- | --- |
| کێڵان | کێڵا | کێڵ |
| کوتان | کوتا | کوت |
| پیڤان | پیڤا | پیڤ |
| کڕین | کڕی | کڕ |
| مردن | مرد | مر |
| خوێندن | خوێند | خوێن |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤ |
| گرتن | گرت | گر |
| دانیشتن | دانیشت | دانیش |
| چوون | چوو | چ |
| بوون | بوو | ب |

### خستنەڕوو:

ئـ . پێشـتر زانیمـان، کـە چـاوگ کردەوەیـەک پیشـاندەدات و کردەوەکـە نادرێتـە پـاڵ کەسـێک یـا شـتێک، هەروەهـا کاتـی تێدانییـە، چاوگـەکان بـە پیتـی پێـش (ن)ی چـاوگ دەناسـرێن‌و دەکرێـن بـە پێنـج جـۆر لـە ڕووی نیشـانەوە چاوگـی (ئەلفـی، یائـی، دالـی، تائـی، واوی)*. واتـە چـاوگ بـە یەکێـک لـەم نیشـانانە (ان، یـن، دن، تـن، وون) کۆتایـی دێت‌و بـە هـەر یەکێکیـان دەوترێت نیشـانەی چـاوگ. بـە پیتـی (ن)ە کـەش دەگوترێـت (نوونـی چـاوگ) وەکـو لـە سـتوونی یەکەمـدا خراوەتـە ڕوو.

(کێڵان، کوتـان، پیڤـان، کڕیـن، مـردن، خوێنـدن، ڕەڤیـن، گرتـن، دانیشـتن، چـوون، بـوون).

ب. ئەگـەر سـەیری وشـەکانی سـتوونی دووەم بکەیـن (کێـڵا، کوتـا، پیڤـا، کـڕی، مـرد، خوێنـد، ڕەڤـی، گـرت، دانیشـت، چـوو، بـوو). دەبینیـن هەموویـان لـە چاوگەکانـی سـتوونی یەکـەم وەرگیـراون، بـە لابردنـی نونـی چـاوگ دروسـتکراون، بـە ئەمانـە دەگوترێـت (قـەد) یـان (کاری ڕابـردووی نزیـک)، کـە دەبێتـە بنچینـەی دروسـتکردنی هەمـوو جۆرەکانـی تـری کاری ڕابـردوو، کـە لەمـەودوا دەیـان خوێنیـن.

پ. ئەگەر سـەیری وشـەکانی سـتوونی سـێیەم بکەین (کێڵ، کوت، پیڤ، کڕ، مر، خوێن، ڕەڤ ، گر، دانیش، چـ ، ب) دەبینین هەموویان لـە چاوگەکانی ستوونی یەکـەم وەرگیراونو پێیان دەگوترێت (ڕەگی کار) ، بەشـی هـەرە زۆری (ڕەگی کار) بـە تەنیا بـەکار نایـەتو مانـای تـەواو نابەخشـێت، بـەڵام دەبێتـە سـەرچاوە بۆ دروسـتکردنی کاری (ڕانەبردوو، داخـوازی)و گەلێک وشـەی تـر.

نووسینیدا لە جیاتی نیشانەی پرس (؟) نیشانەی سەرسووڕمان (!) دادەنرێت.

**زۆربەی پەیڤەکانی سەرسووڕمان لە زمانی کوردیدا ئەمانەن:**

**(ئای، ئاخ، ئۆف، مخابن، ئافەرین، بژی، ئۆخەی... هتد).**

## ڕاهێنانی (١)

ڕستەی سەرسوڕمان لەمانەی خوارەوە دروست بکە:

(گوڵێکی جوان، قارەمانێك، بەڵایەکی گەورە، نەمانی زۆرداری، سەرکەفتنا پێشمەرگەی)

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانەی خوارەوە بە پەیڤێکی سەرسوڕمان پڕبکەوە:

١. .........! ئەوە تەواوتکرد.

٢. .........! ل گەل مە نەهات.

٣. ......... ڤێرە چەند جهەکێ خۆشە!

٤. ......... چەند ماندوو بووم!

٥. ......... چۆن پیاوێك بوو!

## ڕاهێنانی (٣)

ئەمانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(ئۆخەی!، بژی!، ئای!، ئافەرین!، ئۆف!)

## ڕاهێنانی (٤)

١.شلۆڤەکردن:

**ئای! کاوە کەوت.**

ئای: وشەی سەرسوڕمانە.

کاوە: ناوە، تایبەتییە، سادەیە، بکەرە.

کەوت: کاری ڕابردووە، تێنەپەڕە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

ئـ- گوڵەکە چەند جوانە!

ب- ئۆخەی! بە یەکەم دەرچوویت.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتاکەی |
|---|---|
| دادخواز | دادپەروەر |
| هیوا | هێڤی، ئومێد |
| بەدی | دیار، ئاشکرا |
| سەرسوڕمان | مەندەهۆشی، سەرسام، حەپەسان |
| منداڵ | زارۆك |
| هۆزان | شیعر |
| ڤەهاند | هۆنییەوە |
| شینەشاهۆ | جۆرێکی گەورەی بازە |

(وانەی دەیەم)

# بنچینەکانی ڕستە

## ئـ- (بکەر- کاری تەواو)

١. دلۆڤان دچیت بۆ قوتابخانە.

٢. فەرهاد دانیشت.

٣. ڕەزڤانی زەڤی ئاڤدا.

٤. باران باری.

٥. کەوەکە دەفڕێت.

٦. دارای سێڤ خار.

## ب- (نیهاد- کاری ناتەواو)

١. دایکا وان دڵسۆز بوو.

٢. سەردار تۆلازەکێ[1] ڕەوشنبیرە.

٣. پاڵتۆکە بۆ ژیلە دەبێت.

٤. فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەی هەژار بەسوودە.

٥. قوتابییەکە دەبێت بە پزیشك.

٦. زڤستان سارە.

---

[1]- تۆلاز: لاو، گەنج

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەبینین هەر ڕستەیەك لە دوو بەش پێکهاتووە، ئەگەر یەکێکیان لاببەین شێرازەی ڕستەکە تێکدەچێتو لە مەبەستەکەی ناگەین. بۆ نمونە: لە ڕستەی (دلۆڤان دچیت بۆ قوتابخانە) ئەگەر وشەی (دچیت) لابدەین، ئەوی دیکەیان بە تەنیا ناتوانێت مەبەستی ڕستەکە بدات بە دەستەوە، هەروەها ڕستەکانی دیکەش، بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو ڕستەیەك لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت، ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی تەواوبوو، بنچینەی ڕستەکە بەم شێوەیە دەبێت: یەکێکیان (بکەر)ەو ئەوەی تریان (کار)ە. وەکو لەمەولا ڕوونی دەکەینەوە.

١. لە ڕستەی (دلۆڤان دچیت بۆ قوتابخانە) وشەی دلۆڤان ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی دچیت (کار)ە چونکە کردەوەیەکی پیشانداوە، کە دلۆڤان کردوویەتی.

٢. لە ڕستەی (فەرهاد دانیشت). وشەی فەرهاد ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی دانیشت (کار)ە چونکە کردەوەیەکی پیشانداوە، کە فەرهاد کردوویەتی.

٣. لە ڕستەی (ڕەزڤانی زەڤی ئاڤدا) وشەی ڕەزڤان ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی ئاڤدا (کار)ە چونکە کارێکی پیشانداوە کە ڕەزڤان کردوویەتی.

٤. له ڕستەی (باران باری). وشەی باران ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی دراوەتە پاڵ، وشەی باری (کار)ە چونکە کارێکی پیشانداوە کە دراوەتە پاڵ باران.

٥. له ڕستەی (کەوەکە دەفڕێت). وشەی کەوەکە ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە، وشەی دەفڕێت (کار)ە چونکە کارێکی پیشانداوە، کە کەوەکە کردوویەتی.

٦. له ڕستەی (دارای سێڤ خار) وشەی دارا ناوە، (بکەر)ە چونکە کارێکی کردووە.

وشەی خار (کار)ە چونکە کارێکی پیشانداوە، کە دارا کردوویەتی:

کەوابوو: له ڕستەی کاری تەواو، ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت بنچینەی یەکەم (بکەر)ەو بنچینەی دووەم (کار)ە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین، کە هەر ڕستەیەك لە دوو بەش پێکهاتووە. یەکێکیان لا ببەین شێرازەی ڕستەکە تێکدەچێتو لە مەبەستەکەی ناگەین، هەموو ڕستەیەك لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت. ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی ناتەواو بوو بنچینەکانی، یەکێکیان نیهادەو ئەوەی تریان گوزارەیە وەکو لەم ڕستانەدا دەردەکەوێت.

١. له ڕستەی (دایکا وان دڵسۆز بوو) وشەی (دایك) ناوە، نیهادە، چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (بوو) کاری ناتەواوە، بە یاریدەی وشەی (دڵسۆز) بووە بە گوزارەو سیفەتێکی داوەتە پاڵ دایك.

٢. لە ڕستەی (سەردار تۆلازەکێ ڕەوشەنبیرە). وشەی سەردار ناوە، نیهادە، چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (ە) کاری ناتەواوە بە یاریدەی وشەی (ڕەوشنبیر) بووە بە گوزارەو سیفەتێکی داوەتە پاڵ سەردار.

٣. لە ڕستەی (پاڵتۆکە بۆ ژیلە دەبێت) وشەی (پاڵتۆکە) ناوە، نیهادە چونکە هەواڵێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (دەبێت) کاری ناتەواوە بە یاریدەی وشەی (بۆ ژیلە ) بووە بە گوزارەو هەواڵێکی داوەتە پاڵ (پاڵتۆکە).

٤. لە ڕستەی (فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەی هەژار بە سوودە). وشەی (فەرهەنگ) ناوە، نیهادە، چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (ە) کاری ناتەواوە بە یاریدەی وشەی (بەسوود) بووە بە گوزارە سیفەتێکی داوەتە پاڵ فەرهەنگ.

٥. لە ڕستەی (قوتابییەکە دەبێت بە پزیشك). وشەی (قوتابییەکە) ناوە، نیهادە، چونکە هەواڵێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (دەبێت) کاری ناتەواوە، بە یاریدەی وشەی (پزیشك) بووە بە گوزارەو هەواڵێکی داوەتە پاڵ قوتابییەکە.

٦. له ڕستەی (زڤستان سارە). وشەی (زڤستان) ناوە، نیهادە، چونکە سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، وشەی (ە) کاری ناتەواوە بە یارمەتی وشەی (سار) بووە بە گوزارەو سیفەتێکی داوەتە پاڵ (زڤستان).

کەوابوو: لە ڕستەی کاری ناتەواودا بنچینەکانی ڕستە بریتین لە (نیهاد، گوزارە).

## دەستور:

**ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت ئەگەر یەکێکیان لابرێت ڕستە تێکدەچێتو لە مەبەستەکەی ناگەین.**

**ئـ- ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی تەواوبوو، بنچینەکانی ڕستە بریتین لە (بکەر، کار).**

**ت- ئەگەر کاری ڕستەکە کارێکی ناتەواوبوو، بنچینەکانی ڕستە بریتین لە (نیهاد، گوزارە).**

**بکەر: ئەو کەسەیە یا ئەو شتەیە، کە لەڕستەدا کارێکی کردووە، یان کارێك دەکات، یا کارێکی دەدرێتە پاڵ.**

**کار: ئەوەیە، کە کردەوەیەك پیشاندەداتو دەدرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك، لە کاتێکی دیاریکراودا.**

**نیهاد: ئەو ناوەیە یا ئەو جێناوەیە، کە لەڕستەدا هەواڵێك یا سیفەتێکی دەدرێتە پاڵ بەڵام بە هیچ کارێك هەڵناستێت.**

**گوزارە: بریتییە لە کاری ناتەواو بە یارمەتی وشەیەکی دیکە هەواڵێك یا سیفەتێك دەداتە پاڵ نیهاد.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا بنچینەکانی ڕستەو جۆرەکەی دیاربکە:

١. نێرگز کولیکەکا سپییە.

٢. باخەوان گوڵ دەچێنێت.

٣. کۆچەرێن جافان[1] دچنە زۆزانان.

٤. ئاوەکە دەبێت بە سەهۆڵ.

٥. هەنگ شیلەی گوڵ دەمژێت.

٦. ڕاستی سەردەکەوێت.

## ڕاهێنانی (٢)

پێنج ڕستە بهێنەوە بە مەرجێك بنچینەی سێیانیان (بکەرو کار) بێتو بنچینەی دووانیان (نیهادو گوزارە)بێت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم کارانە لەناو بۆشاییەکانی خوارەوە دابنێ:

(پشکوت، بەزاند، درێژکرد، ڕاگەیاند، دەست پێکرد، گرتەوە، هاتن)

گەلی کوردستان شێرانە ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری (١٩٩١)ز ......... هێزی شەڕی ......... مۆژدەی سەرکەوتنی ......... غونچەی ئازادی کە بە خوێنی شەهیدان ئاودرابوو دەمی ......... کامەرانی هەموو لایەکی ......... پەرلەمانو حکومەتی کوردستان .........ە کایەوە.

---

(١)جاف: خێڵێکی کوردە

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤەبکە:

١. شەرمین دەچێت بۆ قوتابخانە.

٢. بەهاری کوردستان ڕەنگینە.

(وانەی یازدەهەم)

# کار

## ئ- کاری تەواو

١. کاوەی ئاسنگەر شۆڕشی لە دژی زۆرداری بەرپاکرد.

٢. گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە.

٣. کورد بە ئازادی ئەندامانی پەرلەمانی هەڵبژارد.

٤. شرینیَ پەز دۆشی.

٥. ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون.

٦. ئاراسی ماسی دناڤ گۆمێدا گرت.

## ب- کاری ناتەواو

١. دراوی سپی بۆ ڕۆژی ڕەشە.

٢. ئاگر نیشانەی جەژنی نەورۆزە.

٣. گوڵە سپییەکە جوان بوو.

٤. ئاوی گۆزەکە سارد بوو.

٥. دیارییەکە بۆ تاڤان دەبێت.

٦. دیار دەبێت بە مامۆستا.

## خستنەڕوو:

لەوانەی پێشوودا خوێندمان کە ڕستە لەسەر دوو بنچینە پێکدێت ئەویش (بکەر، کار)ە، ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین، دەبینین هەموویان لەسەر ئەو دوو بنچینەیە پێکهاتوونو هەر یەکێکیان، واتاو مەبەستی تەواو دەدات بە دەستەوە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەبینین (بەرپاکرد، دەڕوێتەوە، هەڵبژارد، دۆشی، سەردەکەون، گرت) هەموویان کارنو هەر یەکەیان کردەوەیەکیان پیشانداوە یان پیشانیدەدنو دراونەتە پاڵ کەسێك، کە(بکەر)ەکەیەتی، هەروەها هەر یەکەیان بە تەنیا مانای تەواوو سەربەخۆیان هەیە، بۆیە بەو کارانە دەگوترێت کاری تەواو و (نەلکاون بە وشەی دیکەوە).

جا ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب)، دەبینین (ە) لە ڕستەی یەکەمو دووەمدا (بوو) لە ڕستەی سێیەمو چوارەمداو (دەبێت) لە ڕستەی پێنجەمو شەشەمدا، هەر یەکەیان ڕووداوێکیان پیشانداوە یان پیشانی دەدەن، بەڵام هەر کارێك لەم کارانە بە تەنیا واتای تەواو نابەخشێت، بەڵکو پێویستی بە یارمەتی وشەیەکی دیکە هەیە بۆ ئەوەی واتاکەی تەواو واتادار بێت یان بڵێین وەکو کار ئەرکی خۆی ببینێت، بۆیە بەو کارانە دەگوترێت کاری ناتەواو.

## دەستور:

ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت، بنچینەی یەکەم: بکەرەو بنچینەی دووەم: کارە، کاریش دوو جۆرە:

**ئـ-** کاری تەواو: ئەو کارەیە کە بەبێ یاریدە، کردەوەیەك پیشاندەدات و دراوەتە پاڵ کەسێك یا شتێك، کە (بکەرە)کەیەتی و مانای تەواو و سەربەخۆی هەیە، پێویستی بە وشەیەکی دیکە نییە.

**ب-** کاری ناتەواو: ئەو کارەیە کە کردەوەیەك پیشاندەدات بەڵام بە یاریدەی وشەی دیکە دەتوانێت هەواڵێك یان سیفەتێك بداتە پاڵ نیهادەکەی.

کاری ناتەواویش لە سێ شێوەو تافدا خۆی دەنوێنێت:

کاری ناتەواو

ڕابردوو:
(بوو)

ڕانەبردوو:
(ە) ئێستا
(دەبێت) ئایندە

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا (کاری تەواو – کاری ناتەواو) دەربهێنە:

١. دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە.

٢. پێشمەرگە بە قوربانیدان کوردستانی ڕزگارکرد.

٣. درۆزن دوژمنی خوایە.

٤. ماڵی ئێوە خۆشبوو.

٥. ڕێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ دەیگوت ترشە.

٦. چەم بێ چەقەڵ نابێت.

٧. دەوڵەمەندی بە دڵە بە ماڵ نییە، گەورەیی بە عەقڵە بە ساڵ نییە.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستەیە: ئەسپە سپییەکە جوانە.

١. کاری ڕستەکە دەربهێنە، چ جۆرێکە؟ لە چ دەمێکدایە؟

٢. کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ دەمی ڕابردوو پاشان ڕستەکە بنووسەوە.

٣. کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ دەمی ڕانەبردوو (داهاتوو) پاشان ڕستەکە بنووسەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم وشانەی خوارەوەدا، کاری تەواو و ناتەواو جیابکەرەوە، لەدواییدا بیانخەرە ڕستەوە.

(دەوەرێت، بوو، گریا، دەبێت، ە، فیشکاندی)

## ڕاهێنانی (٤)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. کتێبەکانت خاوێن ڕابگرە. ( کاری ناتەواو، جێناو، ئامراز)

٢. دیمەنی ڕەشماڵی کورد دڵگیرە. (ئامراز، کاری ناتەواو، جێناو)

٣. برنجەکە خوسابوو. (کاری ناتەواو، کاری تەواو، هاوەڵناو)

٤. دار بە گەورەیی ناچەمێتەوە. (کاری ناتەواو، پاشگر، جێناو)

٥. ڕەشەبای سلێمانی بەهێزە. (ئامراز، کاری ناتەواو، پاشگر)

٦. .چیرۆکەکە بەسوود بوو. (کاری ناتەواو، کاری تەواو، کاری یاریدەدەر)

## ڕاهێنانی (٥)

١. شلۆڤەکردن:

**منداڵەکە پێدەکەنێت.**

منداڵەکە: ناوە، ناسراوە، بکەرە.

پێدەکەنێت: کاری ڕانەبردووە، تێنەپەڕە.

ێت: جێناوی لکاوە، بۆ کەسی سێیەمی تاک بۆ بکەر دەگەڕێتەوە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە :

**١. ترێ پێگەیشت.**

**٢. سێوەکە مزر بوو.**

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتاکەی |
| --- | --- |
| پەز | مێگەل، مەڕو بزن |
| دناڤ گۆمێدا | لە ناو گۆماوەکەدا |
| نەدەگەیشت | نەدگەهشتیٚ |
| چەقەڵ | ئاژەلێکی کێوییە لە ڕەگەزی سەگە |
| گەورەیی | مەزناتی |
| پێگەیشت | پێگەهی |
| خوسابوو | نەرم بوو |

# (دیارخەری ناو- تەواوکەری کار)

١. دایکی شەهید فرمێسکی خوێنین دەڕێژێت.

٢. برادەری ئازاد بە یەکەم دەرچوو.

٣.هەڤالێ من بلەز هات.(١)

٤. قوتابیی زیرەك هۆنراوەکان لەبەردەکات.

٥.مرۆڤێت باش لە تەنگاڤیادا دەردکەڤن.

٦.مامۆستای ئێوە کتێبەکان دابەشدەکات.

٧.ولآتەکەمان بە زانست پێشدەکەوێت.

٨.برایێ تە چیرۆك نڤیسییە.

٩. مە کتێب ژ وی وەرگرت.

١٠. دەشتا هەڤلێرێ ب پیتە.

---

(١) بلەز هات: خێراهات، بەپەلە هات.

## خستنەڕوو:

پێشتر ئەوەمان زانی کە ڕستە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت. (بکەر، کار) یا (نیهاد، گوزارە)، ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکان بکەین، دەبینین:

١. پەیڤی(دایك، برادەر، هەڤاڵ، قوتابی، مرۆڤ، مامۆستا، وڵات، برا، مە). هەر یەکیان لەو شوێنەدا ئەرکی بکەر دەبێنێت، وشەی (دەشت) دەوری نیهادی بینیوە.

٢. پەیڤی (دەڕێژێت، دەرچوو، هات، لەبەردەکات، دەردکەڤن، دابەشدەکات، پێشدەکەوێت، نڤیسییە، وەرگرت)، هەموویان کاری تەواون و(ە) کاری ناتەواوە.

٣. لەم ڕستانەدا بێجگە لە بنچینەکانی ڕستە هەندێك وشەی دیکە دەبینرێت ئەمانە تەواوکەرن بۆ تەواوکردنو زیادە واتای دیکە هێنراونەتە ناو ڕستەکانەوە.

١- لە ڕستەی (دایکی شەهید فرمێسکی خوێنین دەڕێژێت)،

وشەی (شەهید) ناوە، دیارخەری ناوی (دایك)ە، چونکە واتای وشەی دایکی تەواوکردووە کە (بکەر)ە، پەیڤی (فرمێسك) ناوە تەواوکەری کاری (دەڕێژێت)ە واتە بەرکارە، چونکە واتای کارەکەی تەواو کردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر. وشەی (خوێنین) هاوەڵناوە دیارخەری ناوی (فرمێسك)ە، چونکە واتای وشەی فرمێسکی تەواو کردووە.

٢– لە ڕستەی (برادەری ئازاد بە یەکەم دەرچوو)،

وشەی (ئازاد) ناوە دیارخەری ناوی برادەرە، چونکە واتای وشەی (برادەر)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی (بەیەکەم) هاوەڵکارە تەواوکەری کاری (دەرچوو)ە، چونکە واتای کارەکەی زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

٣– لە ڕستەی (هەڤالێ من بلەز هات)،

وشەی (من) جێناوە، دیارخەری ناوی (هەڤاڵ)ە چونکە واتای وشەی (هەڤاڵ)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە، وشەی (بلەز) هاوەڵکارە تەواوکەری کاری (هات)ە چونکە واتای کارەکەی زیاتر ڕوون کردۆتەوە.

٤– لە ڕستەی (قوتابیی زیرەك هۆنراوەکانی لەبەردەکات)،

پەیڤی (زیرەك) هاوەڵناوە، دیارخەری ناوی قوتابییە، چونکە واتای وشەی قوتابی تەواو کردووە کە (بکەر)ە وشەی هۆنراوەکان ناوە تەواوکەری کاری (لەبەر دەکات)ە، واتە بەرکارە، چونکە واتای کاری (لەبەردەکات)ی تەواو کردووەو کاریگەرییەتی کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٥– لە ڕستەی (مرۆڤێت باش ل تەنگاڤیادا دەردکەڤن)،

وشەی باش هاوەڵناوە دیارخەری ناوی (مرۆڤ)ە، چونکە واتای وشەی (مرۆڤ)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی (ل تەنگاڤیادا) هاوەڵکارە تەواوکەری کاری (دەردکەڤن)ە، چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووە.

٦–له ڕستەی (مامۆستای ئێوە کتێبەکان دابەش دەکات)،

وشەی ئێوە جێناوە دیارخەری ناوی مامۆستایە، چونکە واتای وشەی (مامۆستا)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی (کتێبەکان) ناوە، تەواوکەری کاری (دابەشدەکات)ە. واتە بەرکارە، چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٧–له ڕستەی (وڵاتەکەمان بە زانست پێش دەکەوێت)،

وشەی (مان) جێناوە، دیارخەری ناوی (وڵات)ە چونکە واتای وشەی (وڵات)ی تەواوکردووە کە (بکەر)ە. وشەی (زانست) ناوە تەواوکەری بە یاریدەی کاری (پێشدەکەوێت)ە، چونکە واتای کارەکەی بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی (بە) زیاتر ڕوون کردووەتەوە.

٨–له ڕستەی (برایێ تە چیرۆك نڤیسییە)،

وشەی (تە) جێناوە، دیارخەری ناوی (برا)یە، چونکە واتای وشەی (برا)ی تەواوکردووە، کە (بکەر)ە. وشەی (چیرۆك) ناوە، تەواوکەری نڤیسییە، واتە بەرکارە چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووەو کاریگەریی کارەکەشی کەوتۆتە سەر.

٩– له ڕستەی (مە کتێب ژ وی وەرگرت)،

وشەی کتێب ناوە تەواوکەری کاری (وەرگرت)ە، واتە بەرکارە چونکە واتای کارەکەی تەواوکردووەو کاریگەری کارەکەشی کەوتۆتە سەر، وشەی (وی) جێناوە تەواوکەری بە یاریدەی کاری (وەرگرت)ە، چونکە

واتـــای کارەکـــەی بـــە یارمـــەتی ئـــامرازی پەیوەنـــدی (ژ) زیـــاتر ڕوونکردووەتەوە.

١٠- لە ڕستەی (دەشتا هەڤلێرێ بەپیتە)،

وشـەی هـەڤلێرێ نـاوە، دیارخـەری نـاوی (دەشـت)ە، چـونکە واتـای وشـەی (دەشت)ی تەواوکردووە کـە نیهـادە، وشـەی (بـەپیت) هاوەڵنـاوە تەواوکـەری کاری ناتەواوی (ە)یە.

## دەستور:

تەواوکەر: ئەو وشەیەیە یان ئەو وشانەیە کە لەڕستەدا دەبینرێن بێجگە لە بنچینەکانی ڕستە (بکەر،کار).

تەواوکەر دوو جۆرە:

ئـ- دیارخەری ناو: بریتییە لە ( ناو، جێناو، هاوەڵناو)

ب- تەواوکەری کار: بریتییە لە (بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە) هەروەها هاوەڵکاریش دەگرێتەوە.



## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیارخەری ناو و تەواوکەری کار دەربهێنە:

١. مرۆڤی زانا پێشدەکەوێت.

٢. چیاکانی کوردستان بەرزن.

٣. بارام گۆڤارەکەی هێناوە.

٤. پار چووین بۆ سەیران.

٥. بازنێ زێڕ ب نرخە.

٦. دارا کتێبەکەی لە کتێبخانە کڕی.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك جارێـك ببنـە دیارخـەری نـاو، جارێك ببنە تەواوکەری کار:

(ڕەز، گوڵ، چێشت، بەپەلە، زانست، کارگە، ڕووبار)

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

**١. برای ئاری کتێب دەفرۆشێت.**

**٢. دارڤان داران دبڕێت.**

**٣. دیار گۆڤاری لە کتێبخانە وەرگرت.**

# - نــــاو -

**ئەم پارچە پەخشانە بخوێنەوە:**

**(سەرەتای بەهار بوو، تازە گوڵ و لالەی ئەو دەشت و دەرە سەریان دەرهێنابوو، بەدەم شنەبای فێنك پێدەكـەنین. نێرگـزو بـەیبون و مێلاقـەو شـلێر ئـەو ناوەیـان خەملاندبوو. بەرخ و كاریلە دەمیان لە گیای بەهار نابوو، قاسپەی كەو لە ترۆپـك و قەد پاڵەكاندا دەنگی دەدایەوە، هەتاوی نەورۆزیی لە لوتكەی چیا بڵندەكەی ئەو بەر گوندەكەمان هەڵات. تیشكی زێوینی بەسەر بەفری لاپاڵی شاخەكاندا، بەسەر لالەزارو گوڵزاری ئەو ناوەدا پەخشكرد. كوڕو كچ، لاو و پیری گونـدێ مـە تێكـڕا خۆیان بۆ سەیرانی نەورۆز ئامادەكردبوو، دەستەو كۆمەڵ پێكڤە بەرەو سەیرانگای ناوچەكە دەچوون. خەڵك لە گوندەكانی دەورووبەریش ڕوویان لـەو سـەیرانگایە كرد، لەوێ هەموو بەیەك دڵ گۆرانی و ستران و سرودیان بۆ ئەو جەژنە نەتەوەییـە دەچڕاند، من و كاوەی برادەریشم ڕوومـان لـەوێكرد، شـایی و گۆڤەنـد دەسـتی پێكرد، سێپێی و شێخانی و سوسكەیی، سەماوەر لـە هـەموو لایـەك جۆشـدراو چـا خورایـەوە، دیسـان كـوڕو كچـێت گونـدییان دەسـتیان تێكگـرتن و زەماوەنـدو هەڵپەڕكێ دەستی پێكردەوە، ئێڤارێ، هەموو بە دڵێكی پڕ لە خۆشی و شادی، بـە ئازادی و تەناهی بەرەڤ گوندێن خۆ گەڕانەوە، پاش ئـەوەی چـاویان بـە جـوانی بەهار گەشایەوە).**

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەڤ پارچە پەخشانە دەبینین پەیڤی وای تێدایە کە:

١. هەندێکیان ناوی گیاندارێك دیار دەکەن (ئاژەڵ بێ یان ڕووەك) وەك: (بەرخ، کاریلە، نێرگز، مێلاقە، شلێر).

٢. یان وشەی وا لەناو پەخشانەکەدا هەیە، کە ناون بۆ شتی بێ گیان وەك: (نان، سەماوەر، چا).

٣. هەندێ پەیڤی تێدایە کە ناون بۆ دیاریکردنی جێگاو شوێن وەك: (گوند، سەیرانگا).

٤. دیسان پارچە پەخشانەکە پەیڤی وای تێدایە کە ناوی کەسێکی دیارو تایبەتی پیشان دەدا وەك: (کاوە).

٥. هەر لەو پەخشانەدا جۆرە وشەی وا بەرچاو دەکەوێت کە بیرێك یان هەستێك پیشان دەدەن وەك: (خۆشی، شادی، ئازادی، تەناهی، جوانی).

بەم جۆرە هەر وشەیەك لەوانەی کە دەرمان خستنو پیشانمان دان بۆ دەربڕینی مەبەستێك بەکارمان هێناون، پێیان دەگوترێت (ناو).

## دەستور:

**ناو وشەیەکە بۆ ناونان‌و دیاریکردن‌و پیشاندانی گیانداریك (مرۆڤ بێ، ئاژەڵ، یان ڕووەك) یان بێ گیانێك (شت بێ یان شوێن) یان بۆ بیرو مەبەستێك بەکاردێت.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستەو هۆنراوانەدا ناوەکان دەست نیشان بکە:

١. ڤی خورتی سەرێ مە بلّندکر.

٢. من جوتیارم، من جوتیارم

من لەگەڵ هەتاو هاوکارم

من بە ئارەق‌و ئەو بەتین

دامان ڕشتووە بناخەی ژین

٣. ئاگر نیشانەی جەژنی نەورۆزە.

٤. ئەو ئەرخەوانە جوانە      کە لە گردی سەیوانە

بەڕیزە ئەو کچانە      وەك قومری[1] دەوریان داوە.

٥. دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤێتە جەرگێ من دوو دۆخ

یەك لسینە یەك لدل دا لەو ژ من تێن ئاخ‌و ئۆخ

---

(١) قومری: جۆرە کۆترێکی شینە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە ناوێك پڕ بكەوە:

١. هەولێر ............ هەرێمی فیدڕاڵی كوردستانی عیراقە.

٢. هەنگ شیلەی ............دەمژێتو ............ دروست دەكات.

٣. شانۆ ............ ی گەلە.

٤. ............ ئەندامێ دیتنێیە.

٥. ئاڤا ............ ژ بەفرو بارانێ پەیدا دبیت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ناوانە لە ڕستەدا بەكاربهێنە:

( ڕاستی، هەنار، ڕەزڤان، برادۆست، هەڵەبجە)

## ڕاهێنانی (٤)

١. شلۆڤەكردن:

بارام نووست.

بارام: ناوە، بكەرە

نووست: كارە، ڕابردووە، تێنەپەڕە

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبكە:

١. شیلان هات. ٢. شێروانی هەرمی خار.

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتاکەی |
|---|---|
| مێلاقە | جۆرە گوڵێکی چیاییە |
| ترۆپك | لوتکە، سەرێ چیای |
| قەدپاڵەکان | لاپاڵی چیای |
| پەخشکرد | بەلاڤکر ، بڵاوی کردەوە |
| خورت | لاو، گەنج، تۆلاز |

( وانەی چواردەهەم )

# جۆرەکانی ناو

## ئـ- ناو لەڕووی ناوەرۆکەوە

## ناوی تایبەتی- گشتی- کۆمەڵ

لەوانەی پەروەردەی نیشتمانیدا مامۆستا گوتی:

( هەرێمی فیدراڵی کوردستانی عیراق، ئانکو باشورا کوردستانێ، لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ز گۆڕانێکی زۆری بە خۆوە دیت، ئەڤ هەرێمە لە پێنج پارێزگا پێك دێت، هەولێرو سلێمانیو کەرکوكو دهۆكو هەڵەبجە، چەند قەزایێکی دیکەش هەن کە بەشێکن لەو هەرێمە وەکو: خانەقینو شەنگارو بەدرە. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی ڕێڤەبەریا کوردی، گەلێك پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە هاتنە جێ بەجێکردن. سەدان باژێرو گوندو دێ نۆژەن کرانەوەو سەر لەنوو هاتن ئاڤاکرن، سەدان کیلۆمەتر ڕێو بان دروستکران. ژمارەیەکی زۆری کارگەو کارخانە کەوتنەوە گەڕ، بایەخدرا بە کاروباری چاندنو کتشوکاڵ بە ڤەژیاندنا سامانی ئاژەڵو بەخێوکردنی مەڕو بزنو پەزو گاو چێلو مریشك. پەرلەمانی کوردستانو حکومەتی هەرێم ژی هاتن دامەزراندن. گەلی کورد لەم بەشەی کوردستاندا دەسەڵاتی گرتە دەست.

چەندین زانکۆی تازە لە هەولێرو سلێمانیو دهۆكو دەیان قوتابخانەو خاندنگە کرانەوە. نازدارا کچا منو سەربەستێ برایێ وێ لەم زانکۆیانە دەخوێنن. کۆمەڵی کوردەواری لە گەلێك لایەنەوە پێشکەفت. لەبەر هەندێ پێویستە بە دڵو گیان ئەزموونی دیموکراتی گەلی خۆمان بپارێزینو هەموو ببین بە سەرباز بۆ پاراستنا ڤان دەستکەفتان ).

## خستنەڕوو:

ئەگەر بە وردی پەیڤەکانی مامۆستای پەروەردەی نیشتمانی بخوێنینەوە، دەبینین چەند ڕستەیەکی تێدایە وەکو:

١. ئەڤ هەرێمە لەپێنج پارێزگا پێکدێت هەولێرو سلێمانیو کەرکوکو دهۆک و هەڵەبجە.

٢. سەدان باژێرو گوند تۆژەنکرانەوەو سەر لەنوو هاتنە ئاڤاکرن.

٣. بایەخدرا بە کاروباری چاندنو کشتوکاڵو بە ڤەژیاندنا سامانی ئاژەڵو بەخێوکردنی مەڕو بزنو پەزو گاو چێڵو مریشك.

٤. نازدارا کچا منو سەربەستێ برایێ وێ لەم دوو زانکۆیە دخوینن.

٥. گەلی کورد لەم بەشەی کوردستاندا دەسەڵاتی گرتە دەست.

دیسان ئەگەر بە وردی بەرێ خۆ بدەینە ڕستەکان دبینین:

لە ڕستەی یەکەمدا ناوی چەند شارێك هاتووە کە دەکەونە هەرێمی کوردستان وەك (هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، دهۆك، هەڵەبجە ) کە هەر یەك ژ وان، ناوە بۆ **شارێکی دیاریکراو و ناوەکە دەبێتە ناوی (تایبەتی).**

لە ڕستەی دووەمدا وشەی (باژێر، گوند، دێ) هەر یەکەیان ناوەو بەسەر هەموو گوندو دێو باژێرێکدا دابڕاوە، چونکە لە یەك ڕەگەزن، بۆیە ئەو جۆرە ناوانە پێیان دەگوترێت ناوی (گشتی).

لە ڕستەی سێیەمیشدا دیسان بێژەکانی (مەڕ، بزن، پەز، گا، چێڵ، مریشك)، کە جانەوەرو گیاندارن، ناوی گشتین، چونکە بۆ ڕەگەزی ئەو گیاندارانەو بۆ تاکە تاکەیان بەکار دێت.

لە ڕستەی چوارەمدا وشەکانی (نازدار، سەربەست) دوو ناون، کە بۆ دوو کەسی دیاری دەستنیشانکراو بەکارهاتوونو پێیان دەگوترێت ناوی (تایبەتی).

لە ڕستەی پێنجەمیشدا وشەی (گەل) لە ڕواڵەتدا تاکە، بەڵام لە ناوەرۆكو واتادا (کۆ)یە، چونکە بێژەکە تێکڕا ئەو هەموو کەسانە دەگرێتەوە کە پێکڤە پێیان دەگوترێت (گەل)، ئەو جۆرە ناوەش پێیدەگوترێت ناوی (کۆمەڵ).

## دەستور:

**ناو لە ڕووی ناوەرۆکەوە دەکرێت بە سێ جۆر:**

**١. ناوی تایبەتی: ئەو ناوەیە کە بەتایبەتی بەکاردێت بۆ ناونانی کەسێك یان شتێك یان شوێنێکی دیاریکراو و تایبەت وەك:**

**(ئەڤین- شێرکۆ- نازدار- هەندرێن- مەتین- دهۆك- کەرکوك)**

**ناوی تایبەتیش بۆی هەیە:**

**ئـ- ناوی کەسان بێت، وەك: دارا، لاڤە، لەوەند، خوناڤ**

**ب- ناوی ڕوبارو چیاو شارو گوند بێت، وەك: سیروان، سەفین، کەرکوك، سۆربەش[1]**

**پ- ناوی وڵاتو میللەت بێت، وەك: کوردستان، ئازەری**

[1] – **سۆربەش**: گوندێکە سەر بە پارێزگای هەولێرە

٢. **ناوی گشتی:** ئەو ناوەیە کە بۆ هەموو ئەو گیاندارو بێ گیانانە بەکاردێت کە خودانی یەك ڕەگەزن‌و ناوەکە بەسەر تێکڕاو بەسەر تاکە تاکەی ئەو ڕەگەزانە دابڕاوە. ئەو جۆرە ناوەش بۆی هەیە:

ئا- بۆ کەس بەکاربێت وەك: مامۆستا، کچ، کوڕ، دایك.

ب- بۆ ئاژەڵ‌و باڵندەو ڕووەك‌و میوە بەکاربێت وەك: شێر، گورگ، ماین، هرچ، پەز، کەو، کۆتر، مراوی، گەنم، جۆ، سێو، هەنجیر.

پ- بۆ شتان بەکاربێت (بێ گیان) وەك: بەرد، دار، چیا، ڕوبار، خانوو.

٣.**ناوی کۆمەڵ:** ناوێکە بە ڕواڵەت تاك پیشاندەدات، بەڵام لە ناوەرۆکدا واتای کۆ دەبەخشێت، ئەم جۆرە ناوەش بۆی هەیە:

ئـ- بۆ کۆمەڵە کەسێك بەکاربێت وەك: لەشکر، گەل، میللەت، هۆز، دەستە، چین، تیرە.

ب -بۆ ژمارەیەك گیاندارو ڕووەك بەکاربێت، وەك: گاڕان، مێگەل، ڕەوە، گەلە، ڕان، گاگەل، ڕەڤد (رەڤدا گورگان)، ڕەز، چەپك، دەسك، قامك.

## ڕاهێنانی (١)

جۆری ئەم ناوانە دیاربکە:

(پیاو، زۆزك، قوتابی، جەژن، نێرگز، ئەحمەدی خانی، مێگەل، میللەت، زەردەشت)

## ڕاهێنانی (٢)

لەم پارچە هۆنراوەیەدا ناوەکان دەست نیشان بکەو جۆرەکانیشیان دیاربخە.

| | |
|---|---|
| بۆ ڕۆژی نەورۆز سێ چەپك | لە نێرگزو گوڵی ناسك |
| ئەکەم بە دیارییەکی جوان | بۆ گەلی کوردی قارەمان |
| گوڵاڵە سوورەی پارچەی دڵ | هی دڵێك کە کەوتە ژێر گڵ |
| دڵی ئەو لاوەی بۆ میللەت | جەڕانیان[1] لە گەردنیا پەت |
| چرای گیانیان کوژانەوە | شەماڵ جەستەی شەکانەوە |
| ئەم چەپکە گوڵەی من پێشکەش | بەوەی گڕ ئەگرێتە باوەش |
| بەو لاوانەی کە بۆ وەتەن | لە خەباتا پشوو نادەن |
| بۆ ژینی کورد بوون بە پێشەنگ | بوون بە مەشخەڵی شەوە زەنگ |

---

(١) جەڕانیان لە گەردنیا پەت: پەتك ل گەردەنێ وی ئالاند.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانە بە ناوێکی گشتی پڕ بکەوە:

١. باخەکەمان .......... ی جوانی تێدایە.

٢. چەم بێ .......... نابێ.

٣. پێویستە .......... هەموو ساڵێك لەوانەکانی دەرچێت.

٤. .......... نەخۆشی بڵاو دەکاتەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

وشە هێڵ بەژێر داهاتووەکان لەم ڕستانەدا شلۆڤەبکە:

١. ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ ئاڤ دا.

٢. لەشکر سنوورەکانی وڵات دەپارێزێت.

٣. سێڤێن بەرواری بناڤ و دەنگن.

٤. گوڵێکم بۆ مامۆستا برد.

٥. سلێمانی شاری هەڵمەتو قوربانییە.

( وانەی چواردەهەم )

# جۆرەکانی ناو

## ب- ناو لەڕووی هەبوونەوە

## ناوی بەرجەستەو ناوی واتایی

جوتیارێك گێڕایەوەو گوتی :

( ڕۆژەکە زۆر سارد بوو، هەوری ڕەش سەرتاپا ئاسمانی ناوچەکەی داپۆشیبوو، زەوی گەلەك تێنوو بوو، ئارەزووی بارانی دەکرد، لە ناکاو کردی بە هەورە تریشقەو لێزمەی باران، جوتیارو شڤان و گاوان، کەوتنە خۆشی و شادی، چونکە کاتێك بەفرو باران زۆر بوو، کانیاو دەردەبن، ئاوی چەم و ڕوبار زۆر دەبێت، لە بەهاردا جوانی هەموو لایەکی سروشت دەگرێتەوە، خەم و پەژارە لە دڵ نامێنێت، هێزو وزە دەکەوێتە گیانی زیندەوەرو جانەواران. لەم وەرزەدا بەرهەمی ئاژەڵان زۆر دەبێت، وەك: ماست، پەنیر، فرۆ، لۆر، سەرتوو و نڤیشك).

## خستنەڕوو:

لە خوێندنەوەی ئەم پارچە نووسینەدا چەند ڕستەیەك دێنە بەرچاو، وەك:

١. ڕۆژەکە سارد بوو، هەوری ڕەش سەرتاپا ئاسمانی ناوچەکەی داپۆشیبوو.

٢. لەم وەرزەدا بەرهەمی ئاژەڵان زۆر دەبێت، وەك: ماست، پەنیر، فرۆ، لۆر، سەرتوو و نڤیشك.

٣. لە ناکاو کردی بە هەورە تریشقەو لێزمەی باران، جوتیارو شڤانو گاوان کەوتنە خۆشیو شادی.

٤. لە بەهاردا جوانی هەموو لایەکی سروشت دەگرێتەوە، خەمو پەژارە لە دڵ نامێنێت.

ڕستەی یەکەم هەندێك ناوی تێدایە کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانن ناوەکانیش بریتین لە (هەور، ئاسمان)، کە لەو ناوانەن بەر یەکێك لە هەستەکانی مرۆڤ[1] دەکەون ئەویش هەستی بینینە، لەبەر هەندێ پێیان دەگوترێت ناوی (بەرجەستە).

لە ڕستەی دووەمیشدا کۆمەڵە ناوێك هەن، کە هەر یەکەیان بەر هەستێك یا پتر لە هەستێکی مرۆڤ دەکەونو پێیان دەگوترێت ناوی بەرجەستە، وەك: ماست، پەنیر، فرۆ، لۆر، سەرتوو و نڤیشك.

ئەگەر لە ڕستەی سێیەم ڕامینێین، دەبینین ڕستەکە ژمارەیەك ناوی تێدایە، بەڵام ئەوەی مەبەستمانە هەردوو ناوی (خۆشیو شادی)یە، کە لە خۆیاندا بوونی سەربەخۆیان نییە، ناکەونە بەر یەکێك لە پێنج هەستەکەی

[1] – پێنج هەستەکەی مرۆڤ ئەمانەن: ( بینین، بیستن، گرتن، تامکردن، بۆنکردن )

مرۆڤ، بەڵکو تەنیا لە بیرو خەیاڵو هزردا بوونیان هەیە، ناوەکانی ئەم چەشنەش پێیان دەگوترێت ناوی (واتایی).

دیسان لە ڕستەی چوارەمدا ناوەکانی (جوانی، خەم، پەژارە) بەر ئەو جۆرە ناوانە دەکەون کە لەهزرو خەیاڵدا پەیدادەبنو بەر هیچ یەك لەو پێنج هەستەی کە مرۆڤ هەیەتی ناکەون، بۆیە بەوان ژی دەگوترێت ناوی (واتایی).

ناوی واتاییش دوو جۆری هەیە:

ئ- ناوی واتایی بنجی، کە هەر لە بنەڕەتدا بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێن، وەك: خەم، هێز، وزە، هۆش، باوەڕ، ترس، مەرگ...هتد.

ب-ناوی واتایی دروستکراو، کە لە وشەیەك و بەیاریدەی پاشگرێك دروست دەکرێت، وەك: مێرانی، کوردینی، دۆستایەتی، پیاوەتی، ڕەشایی، مەزناتی، جوانی...هتد.

## دەستور:

لە ڕووی هەبوونەوە ناو دوو جۆرە:

١. **ناوی بەرجەستە:** ئەو ناوەیە، کە بەر یەك لە پێنج هەستەکانی مرۆڤ دەکەوێتو بوونی مادی هەیە.

٢. **ناوی واتایی[١]:** ناوێکە لە خۆیدا بوونی مادی نییە، بەر هیچ یەك لە هەستەکانی مرۆڤ ناکەوێت، تەنیا لە بیرو خەیاڵدا پەیدا دەبێت، ئەویش دوو جۆرە:

ئـ- بنجی ب- دروستکراو.

[١] – لە زمانی کوردی هەموو چاوگێك ناوی واتاییە.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ناوە واتاییانە لە ڕستەدا بەکاربێنە.

(مرۆڤینی، زیرەکی، برایەتی، جەنگ، ئاشتی)

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا ناوە واتاییەکان دەربهێنەو جۆرەکەیان پیشان بدە:

١. هەستی نەتەوایەتی پیرۆزە.

٢. کۆتری ئاشتی زۆر جوانە.

٣. هەمیشە تروسکەی هیوا ناکوژێتەوە.

٤. دووربینی پەشیمانی لەدوا نییە.

٥. خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.

٦. خەو بۆ مرۆڤ پێویستە.

٧. تا مرۆڤایەتی مابێت، ژیان ناوەستێت.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم ڕستانەدا تەنها ناوە بەرجەستەکان دەربهێنە:

١. تریفە بەیانیان هێلکەو نقیشك دەخوات.

٢. گەنمو جۆ دوو بەرهەمی زستانن.

٣. ل بەهارێ خوناڤ [1] دکەفیتە سەر پەلکێت داران

٤. مەتینی دەستێ خۆ ب تەڤشوی [2] بڕی.

٥. جوتیاری زەڤی کێلا.

---

(١) خوناڤ: خوناو، ئاونگ، شەونم.

(٢) ب تەڤشوی: بە تەشوێ.

## ڕاهێنانی (٤)

### ١. شلۆڤەکردن:

**کەوەکەی خەسرەو فڕی.**

کەوەکە: ناوە، گشتییە، بەرجەستەیە، دیارخراوە، ناسراوە، بکەرە.

ی: ئامرازی دانەپاڵە.

خەسرەو: ناوە، تایبەتییە، دیارخەری ناوی (کەو)ە.

فڕی: کاری ڕابردووی نزیکە.

### ٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

**١. ترس مرۆڤ دەتۆقێنێت.**

**٢. خوێندەواری چرای ژیانە.**

# ئەرکی ناو لەڕستەدا

## ڕستەکان:

١. پیرۆت نانی خوارد.

پیرۆتی نان خار.

٢. کوڕەکەی پیرۆت ئەندازیارە.

کوڕێ پیرۆتی ئەندازیارە.

٣. پیرۆتم لە شاری هەولێر دیت.

من پیرۆت ل باژێرێ هەولێرێ دیت.

٤. کتێبەکەم لە پیرۆت وەرگرت.

من کتێب ژ پیرۆتی وەرگرت.

٥. ئەمە پیرۆتە.

ئەڤە پیرۆتە.

کتێبەکە بۆ پیرۆت بوو.

٦. پیرۆت زیرەکە.

پیرۆت زیرەکە.

٧. پیرۆت خەڵات کرا.

پیرۆت هاتە خەلاتکرن.

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ئەو کۆمەڵە ڕستەیە بکەین، ژمارەیەك ناومان دێتە بەرچاو وەك: (پیرۆت، نان، کوڕ، ئەندازیار، شار، باژێر).

ئەڤ ناوانە دەچنەوە سەر جۆرێك لەو جۆرانەی ناو، کە لەمەوپێش باسمان کردن. بەڵام لە ڕووی ئەو ئەرکەی کە بەو ناوانەمان سپاردووە، هەر یەکەیان ئەرك‌و کارێکی جودای هەیە، بۆ نمونە:

ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی یەکەمدا کاری نان خواردنەکەی دراوەتە پاڵ، واتە کردەوەی خواردنی نانەکە لەلایەن پیرۆتەوە جێبەجێکراوە، لەبەر هەندێ ناوی پیرۆت بووە بە (بکەر). هەر ئەو ناوەی (پیرۆت) لە ڕستەی ژمارە دوودا ئەرکەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چونکە ئەگەر هەر ناوی (کوڕەکە)مان هێنابا، لەوانەبوو بپرسی کە کوڕەکە هی کێیە؟ بۆیە پیرۆت بووە بە دیارخەری ناوی (کوڕەکە) واتە بووە بە دیارخەری ناوێك کە نیهادە.

لە ڕستەی سێیەمیشدا دیسان ئەرکی (پیرۆت) گۆڕاوە، لڤێرێدا (پیرۆت) کەوتووتە بەر کاریگەری کاری تێپەڕی (دیت)و بووە بە (بەرکار) چونکە ئەگەر ناوی (پیرۆت)مان نەهێنابا، نەمان دەزانی کێ بینراوە.

لە ڕستەی ژمارە چواردا ناوی پیرۆت بە هۆی ئامرازی پەیوەندی (لە، ژ) بووە بە (تەواوکەری بەیاریدە).

ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی پێنجەمدا بووە بە تەواوکەر بۆ کارێکی ناتەواو، کە ئەویش کاری ناتەواوی (ە)ی کاتی ئێستایە، بۆیە (پیرۆت) بووە بە (تەواوکەری کاری ناتەواو).

هەر ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی ژمارە پێنجدا، بووە بە تەواوکەری کاری ناتەواو، کارە ناتەواوەکەش بۆ کاتی ڕابردوو (بوو)ە ، بۆیە (پیرۆت) بووە بە تەواوکەری کاری ناتەواو.

ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی ژمارە شەشدا سیفەتێکی دراوەتە پاڵ، کە ئەویش زیرەکییە. کاری ڕستەکەش ناتەواوە، لەبەر ئەوە ناوی (پیرۆت) لێرەدا دەبێتە (نیهاد).

ناوی (پیرۆت) لە ڕستەی ژمارە حەوتدا، بووە بە جێگری بکەر، لەبەر ئەوەی بکەری ڕستەکە دیار نییە، کاری (خەڵاتکرا) دەبێتە بکەر نادیار و ناوی (پیرۆت) شوێنی بکەرەکە دەگرێتەوە.

کەواتە ناوی (پیرۆت) وەکو ناوێکی تایبەتی لەم ڕستانەدا حەوت ئەرکمان پێ سپاردووە، هەر وەك لە ڕستەکاندا ئاشکرا دیارن.

## دەستور:

**ئەركی ناو لە ڕستەدا بەپێی ئەو كارەی كە پێی دەسپێرێت لە گۆڕان دایە، بە گشتی ناو لە ڕستەدا دەبێتە:**

**١. بكەر، ئەگەر كارەكە لەلایەن ناوەكەوە جێبەجێبكرێت.**

**٢. بەركار، ئەگەر كاریگەری كارەكە یەكسەر بكەوێتە سەر ناوەكە، بە مەرجێك كاری ڕستەكە تێپەڕ بێت.**

**٣. دیارخەری ناوێكی دیكە، كە لەم بارەدا دبێژنێ (دیارخەری ناو).**

**٤. تەواوكەر بەهۆی ئامرازێكی پەیوەندی، ئەو كاتە پێی دەگوترێت (تەواوكەری بە یاریدە)، لەم بارەشدا پێتقییە ئامرازێكی پەیوەندی بكەوێتە پێش ناوەكەو ناوەكە دەبێتە تەواوكەری بە یاریدە.**

**٥. تەواوكەری كاری ناتەواو، ئەگەر واتای كارە ناتەواوەكە تەواوبكات.**

**٦. نیهاد، ئەگەر هەواڵێك یان سیفەتێكی درایە پاڵ و كاری ڕستەكەش ناتەواو بوو.**

**٧. جێگری بكەر، ئەگەر كاری ڕستەكە كارێكی بكەرنادیار بوو.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەدا ئەركی ئەو ناوانە پیشان بدە كە هێلیان بەژێردا كێشراوە.

١. <u>هاوین</u> گەرمە.

٢. برام چوو بۆ <u>دهۆك</u>.

٣. <u>شۆڕشڤانان</u> دوژمن شكاندن.

٤. دەبێت شووشەی <u>دەرمان</u> پاك بێت.

٥. سەرداری <u>وانە</u> نڤیسی.

٦. كوڕێ سەرداری <u>پزیشكە</u>.

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. پەپوولەکان ڕەنگاوڕەنگن. (نیهاد، بکەر، بەرکار)

٢. هێمنم لە کتێبخانە بینی. (بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە، دیارخەری ناو)

٣. لوتکەی هەڵگورد بەرزە. (نیهاد، بەرکارە، دیارخەری ناو)

٤. چیرۆکەکەی خوێندەوە. ( بکەر، نیهاد، بەرکار)

## ڕاهێنانی (٣)

بە ڕستە نمونە بۆ ئەم مەبەستانەی خوارەوە بهێنەوە:

١. ناوێکی تایبەتی ببێتە نیهاد.

٢. ناوێکی گشتی ببێتە تەواوکەری بەیاریدە.

٣. ناوێکی گشتی وەکو بەرکار بەکار هاتبێت.

٤. ناوێکی تایبەتی ببێتە تەواوکەری کاری ناتەواوی ئێستا.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

**١. کچا لەزگینی مامۆستایە.**

**٢. هەڤالم لە هەڵەبجە دیت.**

# (جێــناو)

## ئـ. جێناوی کەسی سەربەخۆ

( نیشتمان ئێمەی لە باوەشی خۆی گرتووەو لەژێر سێبەریدا من و تۆ، بە خۆشیو شادییەوە دەژین. کوردستان وڵاتی دێرینی کوردە، باو و باپیرانی هەموومان زادەی ئەم خاکە پیرۆزەن، ئەوان هەر لەبەرەبەیانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە، لەسەر خاکی پیرۆزی کوردستاندا دێو گوندیان ئاوەدان کردەوەو بە چاندن و کشتوکاڵەوە خۆیان خەریککردووە، لە مێژووی کوردستاندا پیاوی مەزن و پاڵەوان زۆرن. کاوەی ئاسنگەر نمونەی تێکۆشەری چەوساوەی میللەتەکەمانە. ئەو بە بازووی پۆڵایین و بە باوەڕی پڕ هێزی، شیا تەخت و بەختی زوحاکی دکتاتۆر سەرنگون بکات. ئێوە پێویستە شارەزای پاڵەوانانی مێژووی گەلی خۆتان بن و ئەوان بکەن بە نمونەو بە پێشڕەو بۆ خۆتان).

## خستنەڕوو:

لە خوێندنەوەی ئەم نووسینەدا هەندێ وشەی وامان بەرچاو دەکەوێت، کە شوێن‌و جێگای کەسێك یان چەند کەسانێکیان گرتووە، لە هەمان کاتیشدا واتای کەسەکە یان کەسەکانیان پیشانداوەو پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە ڕاگەیاندووە. بۆ نمونە لەم نووسیندا وشەی (من) بەرچاو دەکەوێت، کە لەجیاتی تاکە کەسێك بەکارهاتووە، کە ئاخێوەرەکەیە، واتە قسەکەرەو دەبێتە (کەسی یەکەمی تاك).

وشەی (ئێمە)ش بەرچاو دەکەوێت، کە ئەویش لە جێی ئەو کەسانە بەکارهاتووە، کە ئاخێوەرن‌و پێیاندەگوترێت (کەسی یەکەمی کۆ).

دیسان لە نووسینەکەدا وشەی (تۆ) دێتە بەرچاو، ئەویش لە جێی ئەو کەسە بەکارمان هێناوە، کە ڕووی قسەی تێدەکەین‌و لەگەڵیدا دئاخفین. ئەو ژی (کەسی دووەمی تاکە)، کە گوێگر ئانکۆ گۆهدارە.

هەر بەم جۆرە ئەگەر لە خوێندنەوەی نووسینەکە بەردەوام بین، وشەی (ئێوە) دەبینین، کە ئەویش جێناوی سەربەخۆی (کەسی دووەمی کۆ)یەو جێی ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەین‌و دەبنە گوێگر یان گۆهدار.

وشەی (ئەو) کە هەر لە نووسینەکەدا دهێتە دیتن. بۆ ئەو کەسەمان بەکارهێناوە کە بزرەو بە کەسی سێیەمی تاك دهێتە ناسین، واتە جێناوی (ئەو) شوێنی کەسێك دەگرێتەوە، کە لەبەر چاو نییەو لێمانەوە دیار نییە،

کەچی دەبینین وشەی (ئەوان) بۆ چەند کەسێك بەکاردێت، کە لێمانەوە دیارنین‌و بزرن، ئەو کەسانەش بە (کەسی سێیەمی کۆ) ناو دەبرێن.

## دەستور:

**جێناوی کەسیی سەربەخۆ، ئەو وشانەن، کە سەربەخۆ دهێنە گۆتن ونووسین واتای کەسەکە یان کەسەکان پیشاندەدەن‌و پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە ڕوون دەکەنەوە. واتاکانیشیان ئاشکرایەو لە ئاخافتن‌و نووسیندا شوێنی کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم بە تاك‌و کۆیانەوە دەگرنەوە. لە شێوازی کرمانجی خوارووودا ئەم جێناوانە ئەمانەن:**

١. **من: بۆ کەسی یەکەمی تاك.**
٢. **ئێمە: بۆ کەسی یەکەمی کۆ.**
٣. **تۆ: بۆ کەسی دووەمی تاك.**
٤. **ئێوە: بۆ کەسی دووەمی کۆ.**
٥. **ئەو: بۆ کەسی سێیەمی تاك.**
٦. **ئەوان: بۆ کەسی سێیەمی کۆ.**

## ڕاهێنانی (١)

جێناوێکی کەسیی سەربەخۆ لە سەرەتای هەر ڕستەیەك لەم ڕستانە دابنێ:

١. پێم وایە ئەمساڵ هەمووتان دەردەچن.

٢. کارەکان بە پوختی جێبەجێدەکەین.

٣. هەموو ڕۆژێك بەیانیان زۆر زوو لە خەو ڕادەبیت.

٤. خۆمان دەزانین کاروباری وڵاتەکەمان بەڕێوەببەین.

٥. کەی بە ئاواتی دێرینی خۆتان دەگەن؟

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستەیەدا، جێناوە کەسییە سەربەخۆکان لە تاکەوە بگۆڕە بۆ کۆ:

( من لە هەموو کەس زیاتر سودی تۆم دەوێت).

## ڕاهێنانی (٣)

لەم ڕستانەدا، جێناوی کەسیی سەربەخۆی ڕاست هەڵبژێرە:

١. (من– ئەو) ئارەزووی گەشتیاری دەکات.

٢. (ئەوان– ئێمە) بە فڕۆکە دەچین بۆ پاریس.

٣. (تۆ– ئێوە) بخوێنن تا بە ئاوات دەگەن.

٤. (من– ئەوان) چاویان بە ئێوە کەوت.

٥. (ئەو– تۆ) پیاوی دواڕۆژە.

## ڕاهێنانی (٤)

جێناوە سەربەخۆکان دەربهێنە، ئەرکیان دیاربکە:

١. ئێمە نەوەی دوا ڕۆژین.

٢. کتێبەکەم لە ئەو وەرگرت.

٣. وڵاتی من خۆشەویستە.

٤. ئەوان ڕۆیشتبوون.

٥. مامۆستا ئێمەی خەڵاتکرد.

## ب- جێناوی کەسی سەربەخۆ

١. من سێڤەك خار.

٢. مە ئاگرێ نەورۆزێ لسەرێ چیایا هەلکر.

٣. تە نامە بۆ هەڤالێ خۆ نڤیسی.

٤. وە خەبات ژ بۆ ئازادییێ و سەرفرازییێ کر.

٥. وی بارەك ترێ برە دهۆکێ.

٦. وێ گەلەك چیرۆکێن کوردی بۆ مە گۆتن.

٧. وان رێزمانا کوردی خاند.

**خستنەڕوو:**

ئەگەر لە ڕستەکان وردبینەوە دەبنین لە هەر ڕستەیەکدا وشەیەك هەیە، کە لەجێی ناوی ئەو کەسە یان ئەو کەسانە بەکارهاتووە کە کارەکەیان کردووە یان کارەکەیان دراوەتە پاڵ، وشەکان بە تەواوی جێی ناوەکانیان گرتووە. بۆیە پێیان دەڵێین (جێناوی کەسی سەربەخۆ).

١. لە ڕستەی یەکەمدا (من) لە جیاتی کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووە کە قسەکەرە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا (مە) لە جێی کەسی یەکەمی کۆ بەکارهاتووە، کە قسەکەرە.

٣. له ڕستەی سێیەمدا (تە) بۆ کەسی دووەمی تاك بەکارهاتووە کە گوێگر یان گۆهدارە.

٤. له ڕستەی چوارەمدا (وە) بۆ کەسی دووەمی کۆ بەکارهاتووە، کە گوێگرە.

٥. له هەردوو ڕستەی ژمارە پێنج و شەشدا، هەردوو وشەی (وی) و (وێ) بۆ کەسی سێیەمی تاك بەکاردێن، (وی) بۆ تاکی نێرو (وێ) بۆ تاکی مێ.

٦. له ڕستەی حەوتەمدا وشەی (وان) بۆ کەسی سێیەمی کۆ بەکارهاتووە.

## دەستور:

لە کۆمەڵە جێناوی (ب)دا کە سەر بە شێوەزاری کرمانجی ژووروووە جێناوەکانی (من، مە، تە، وە، وی- وێ، وان) لە جێی ناوی ئەو کەسە یان ئەو کەسانە بەکاردێن کە کارەکە دەکەن یان کارەکەیان دەدرێتە پاڵ. ئەم کۆمەڵە جێناوە لە هەردوو باری ئەرێنیو نەرێنیدا بەم جۆرە بەکاردێت:

١. لەگەڵ کاری هەبوون لە ڕابردوو و ڕانەبردوودا.

ئـ- من گۆڤار هەیە. | من گۆڤار نییە.(من نینە)

تە گۆڤار هەیە. | تە گۆڤار نییە. (تە نینە)

وی (وێ) گۆڤار هەیە. | وی (وێ) گۆڤار نییە. (وی نینە)

ب- من گۆڤار هەبوو. | من گۆڤار نەبوو.

تە گۆڤار هەبوو. | تە گۆڤار نەبوو.

وی (وێ) گۆڤار هەبوو. | وی (وێ) گۆڤار نەبوو.

٢. لەگەڵ کاری چاوگی( ڤیان)[١] لە هەموو دەمەکاندا (بە ئەرێنیو نەرێنی).

من گۆڤار ڤیا. | من گۆڤار نەڤیا.

ڕابردوو

تە گۆڤار ڤیا. | تە گۆڤار نەڤیا.

من گۆڤار دڤێت. | من گۆڤار نەڤێت.

ڕانەبردووی

تە گۆڤار دڤێت. | تە گۆڤار نەڤێت. ئێستا (نهۆ)

---

[١] ڤیان: ویستن

**٣. لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ بە هەموو جۆرەکانییەوە (بە ئەرێنیو نەرێنی):**

| | |
|---|---|
| **من گۆڤار کڕی.** | **من گۆڤار نەکڕی.** |
| **تە گۆڤار کڕییە.** | **تە گۆڤار نەکڕییە.** |
| **وی (وێ) گۆڤار کڕیبوو.** | **وی (وێ) گۆڤار نەکڕیبوو.** |
| **مە گۆڤار دکڕی.** | **مە گۆڤار نەدکڕی.** |

## ڕاهێنانی (١)

ئەڤ ڕستەیا ژێری دگەل هەمی جێناڤێن کەسی سەربەخۆ بەکاربینە:

من هندەك پارە ژ برایێ خۆییێ مەزن ستاند.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانە لە تاکەوە بکە بە کۆ:

١. تە ئەرکێ خۆ ب جھ ئینا.

٢. من دگەل وی دەرس خاند.

٣. وێ دوهی ئازاد دیت.

# ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. وی کۆترەك گرت.

٢. وان پەز چەراند.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتا |
|---|---|
| ئاخێوەر | قسەکەر، ئەو کەسێ کو دئاخڤی |
| کات | تاف |
| شیا | توانی |
| هەڤاڵ | هاوڕێ، برادەر، دۆست |
| سەرفراز | سەربڵند، سەربەرز |

## پ. جێناوی کەسیی سەربەخۆ

**ئازادی گۆت ( ئەز کوردمو ئەز وەلات پارێزم، تۆ ژی کوردی، ژ بەر هندێ پێدڤییە ئەم هەمی ب ئێك دل خزمەتا نیشتمانێ خۆ بکەین، ئەزو تو، ئەمو هوین، پێویستە بخوینین، چونکە وەلات تنێ ب زانستو زانیاریێ پێش دکەڤیت، برایێ من ئەڤە دوو سالە ل دەرڤەی کوردستانێیە، ئەو خواندنا پزیشکی لزانکۆیەکا بناڤ و دەنگ دخوینیت، قوتابیێت هەڤالێن وی زیرەکن، ئەو هەمی زاناو شارەزانە).**

### خستنەڕوو:

گەلی کورد تێنووی زانستو زانیارییە، وڵاتیش هەر بەزانست پێشدەکەوێت، لەبەر ئەوە پێویستە هەموو هەوڵو تێکۆشانمان بۆ فێربوونی زانستو زانیاری تەرخان بکەین.

لەم نووسینەدا ژمارەیەك جێناومان بەرچاو دەکەوێت، کە هەریەکەیان جیٚو شوێنی کەسێکی یان چەند کەسێکی گرتووە.

جێناوی (ئەز) بۆ کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووە، کە ئەویش ئاخێوەر یا قسەکەرە.

جێناوی (تو) بۆ کەسی دووەمی تاك بەکارهاتووە، کە گوێگرە.

جێناوی (ئەو) لە دەقەکەدا بەدوو شێوە بەکارهاتووە، جارێکیان بۆ کەسی تاکی نادیار یان بزر وەك لە ڕستەی ئەو (خویندنا پزیشکی ل زانکۆیەکی بناڤ و دەنگ ب دوماهی ئینایە) کە کەسی سێیەمی تاکە، جارێکیشیان بۆ کەسانی نادیار، کە (کەسی سێیەمی کۆ)یە وەك لە ڕستەی (قوتابیێت هەڤالێن وی زیرەکن، ئەو زاناو شارەزانە).

## دەستور:

لە کۆمەڵە جێناوی کەسیی سەربەخۆی (پ)دا کە ئەویش سەر بەشێوە زاری کرمانجی ژووروەوە، جێناوەکان لە جیاتی کەسێك یان ژمارە کەسێك بەکارهاتوون، کە پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە.

جێناوەکانی ئەم کۆمەڵە ئەمانەن:

١. ئەز کە جێی من دەگرێتەوە.

٢. ئەم واتە ئێمە

٣. تو واتە تۆ

٤. هوین واتە ئێوە

٥. ئەو کە بۆ (ئەو)ی تاكو (ئەوان)ی کۆ بەکاردێت.

کۆمەڵە جێناوی (پ) بەم جۆرە بەکاردێت:

١. لەگەڵ کاری تێنەپەڕ لە کاتی (ڕابردوو، ڕانەبردوو) لە هەردوو باری (ئەرێنیو نەرێنی)یەوە، وەك:

| | |
|---|---|
| ئەز هاتم. | ئەز نەهاتم. |
| ئەز دهێم. | ئەز ناهێم. |
| ئەز دێ هێم. | ئەز ناهێم. |

٢. لەگەڵ کاری چاوگی بوون { ڕابردوو، ڕانەبردوو: (ئێستاو داهاتوو) }بە ئەرێو نەرێ، وەك:

| | |
|---|---|
| ئەز بووم. | ئەز نەبووم. |
| ئەزم. | ئەز نیمە. |
| ئەز دبم. | ئەز نابم. |
| ئەز دێ بم. | ئەز نابم. |

**٣. لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ (ئێستاو داهاتوو) لە هەردوو باری (ئەرێو نەرێ)دا، وەك:**

| | |
|---|---|
| **ئەز نان دخۆم.** | **ئەز سێڤ ناخۆم.** |
| **ئەز نان دێ خۆم.** | **ئەز سێڤ ناخۆم.** |

## ڕاهێنانی (١)

جێناوێکی کەسیی سەربەخۆ لەم بۆشاییانە دابنێ:

١. دوهی ............ دگەل هەڤالێ خۆ چووم بۆ فێرگەهێ.

٢. ............ ئەڤ پێنوسە بۆ برایێ خۆ کڕییە.

٣. ............ کچەکا زیرەكو جوانە.

٤. ............ دێ نانی خۆین.

٥. ............ دۆستو هەڤالێن خۆ لتەنگاڤیا بناسن.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم جێناوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(وێ، مە، ئەز، تە، هوین)

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

**١. خوشکا من زیرەکە.**　　　**٢. بابێ وی هات.**

# چـــاوگ

| (٣) | | (٢) | (١) |
|---|---|---|---|
| کاری ڕابردووی نزیك | = | قەدی چاوگ | چاوگ |
| خوێند | | خوێند | خوێندن |
| بڕی | | بڕی | بڕین |
| کەوت | | کەوت | کەوتن |
| برژا | | برژا | برژان |
| بوو | | بوو | بوون |

## خستنەڕوو:

ئەگـەر سـەیری کۆمەڵـە پـەیڤی (خوێنـدن، بـڕین، کـەوتن، بـرژان، بـوون) بکەین، دەبینین هەموویان کۆتاییان بە پیتی (ن) دێت، بـەڵام پیتـەکانی پـێش (ن)ەکە جیاوازن‌و بریتین لە (د، ی، ت، ا، وو)، ئەگەر هەر یەکە لەو پەیڤانە لە ڕستەدا بەکاربهێنین دەبینین کردەوەیەك پیشاندەدەن بێ ئـەوەی هـیچ کاتێـك دەست نیشانبکەن، بۆ نمونە، کە دەڵێین:

خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.

لەم ڕستەیەدا پەیڤی (خوێندن) کردەوەیەك دەردەخات بەڵام بێ ئەوەی کاتی ئەم کردەوەیە پیشان بدات، جگە لەمە پەیڤەکە کۆتایی دێت بە پیتی

(ن) بۆیە ئەم جۆرە پەیڤانە لەزمانی کوردیدا بە (چاوگ) ناو دەبرێن و سەرچاوەن بۆ دروستکردنی هەموو کارەکان.

لە زمانی کوردیدا پێنج جۆرە چاوگ هەن، کە بە پیتی پێش (ن)ەکە دەناسرێنەوە، کە ئەمانەن:

١. چاوگی دالی: خوێندن، بردن، کردن.

٢. چاوگی یائی: نووسین، بڕین، دڕین، سڕین.

٣. چاوگی تائی: بەستن، فرۆشتن، هاتن.

٤. چاوگی ئەلفی: سووتان، دڕان، برژان.

٥. چاوگی واوی: چوون، بوون، دروون.

لە هەر چاوگێکدا ئەگەر (ن)ی چاوگەکە لابدەین ئەوەی دەمێنتەوە پێیدەگوترێت (قەدی چاوگ)، کە لە هەمان کاتیشدا دەبێتە کاری ڕابردووی نزیك، دەتوانین لێرەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە لە کاردا کردەوەیەك هەیەو کاتێکی دیاریکراویش هەیە، کە ئەم کردەوەیەی تیادا ڕوویداوە، بەڵام لە چاوگدا بوونی ئەم کاتە هەستی پێناکرێت.

## دەستور:

**چاوگ:** وشەیەکە کردەوەیەك پیشاندەدات، بەڵام نادرێتە پاڵ کەسێك یان شتێك، کاتیشی تێدانییە. چاوگ سەرچاوەی دروستکردنی هەموو جۆرەکانی کارە.

لە زمانی کوردیدا چاوگ بە پیتی (ن) کۆتایی دێت.

**(چاوگ – ن - قەد - کاری ڕابردووی نزیك)**

### ڕاهێنانی (١)

چەند جۆرە چاوگمان هەیە؟ بۆ هەر جۆرێکیان دوو نمونە بنووسە.

### ڕاهێنانی (٢)

لەم وشانەی خوارەوەدا چاوگەکان، دەربهێنە:

( هەورامان، کێشان، برژان، جیهان، سەربان، کردن، نووستن، نازەنین، بڕین، دروون، چوون، پەخشان )

### ڕاهێنانی (٣)

ئەمانەی خوارەوە ئەگەر ڕاستن، بەرامبەریان بنووسە ڕاستە، ئەگەر هەڵەن، ڕاستییەکەی بە تەواوی بنووسەوە.

١. چاوگ کردەوەیەکە، تافێکی دیاریکراوی نییە.

٢. چاوگو کار هیچ جیاوازییەکیان نییە.

٣. هەر وشەیەك کۆتایی بە پیتی (ن) هاتبوو، ئەوە چاوگە.

٤. بە لابردنی (ن)ی چاوگ، چاوگ وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

# کار لە ڕووی دەم و کاتەوە

## ئـ. کاری ڕابردوو

مـام ( هـێمن )ی شـاعیر لـە پێشـەکی دیـوانی ( تـاریـك‌و ڕوون )دا نووسـیویەتـی‌و دەڵێت :

( من بۆ خۆم لە ئەزموونی پیاوێکی دنیا دیـدەو کۆنسـاڵ کـەڵکم وەرگـرت‌و توانیم بەشێکی زۆر لە دەغڵ‌و دانی خۆمان لەڕزین‌و زایەبوون ڕزگاربکەم.

بەهار درەنگ بوو، هەوا گەرم ببوو، بەڵام بەفر ئارەقیشـی نـەدەکرد، ڕۆژێـك چوومە مزگەوت، تەماشام کرد پیرە پیاوێك بـە تـەنێ لـە تەنیشـت سـۆبە سـاردو سـڕەکە هـەڵکوڕماوە، هـەرمنی دیـت گـوتی: منـداڵی ئـەو زەمانـە ئێمـەی پـێ خەرفاوە، گوتم مامە گیان چ قەوماوە؟ گوتی: بەسەری تۆ ئـەوە چـەند ڕۆژە بـەو کوڕانەی خۆم دەڵێم بچن بەفری سەر ڕەپستەکەمان کـون کـون بکـەن گوێشـم نادەنێ. گوتم: جا، بۆ کونکونی بکەن؟ گوتی: بۆ تۆش نـازانی؟ گـوتم نـاوەڵلا. گوتی، کە ساڵ درەنگ بوو هەرد گەرم دادێ‌و هەڵمێ دەکـا. بـەفریش نایـەڵێ هەڵمەکە بێتە دەرەوە لە ناوخۆیدا دەگەڕێتەوەو دەغڵەکە دەسـوتێ، ئەگـەر کـون بکرێ هەڵمەکەی دێتە دەرەوە ناسووتێ، قسەی مامە پـیرەم بـە دڵیـەوە نووسـا، بەڵام کارەکە زۆر گرانبوو، بەفرەکە ئەوەندە ڕەق بوو بە لۆسـە کـون نـە دەکـرا، بەڵام پاشان تێگەیشتم پەنـدی پێشـینان چـەند ڕاسـتە، کـە گووتویانـە "دەسـتی ماندوو لەسەر زگی تێرە").

## خستنەڕوو:

ئەگەر بە وردی لەو نووسینە وردبینەوە دەبینین کۆمەڵێك کاری ڕابردووی تێدایە، کە دەتوانین هەندێکیان دەست نیشان بکەین، وەك: (کەڵکم وەرگرت، توانیم، گەرم ببوو، ئارەقیشی نەدەکرد، چوومە، هەڵکوڕماوە، دیت، نووسا، خۆش بوو.... هتد). دیارە هەمووشمان ئەو ڕاستییە دەزانین، کە کاری ڕابردوو کارێکە ڕوودانی ئیشێك پیشاندەدات، کە بەر لەکاتی ئاخافتن ڕوویدابێت، واتا مرۆڤ لە کارێك دەدوێت، کە ڕوویداوەو کاتەکەی بەسەرچووە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کارە ڕابردووەکان، هەر چەندە لە ڕابردوودا ڕوویانداوە جیاوازییێك لەکاتی ڕوودانیان هەیە، بۆ نمونە لە ڕستەی (من بەخۆم لە ئەزموونی پیاوێکی دنیا دیدەو کۆنساڵ کەڵکم وەرگرتو توانیم بەشێکی زۆر لە دەغڵو دانی خۆمان لە ڕزینو زایەبوون ڕزگاربکەم).

هەردووکاری (کەڵکم وەرگرت، توانیم) ڕوودانی کارێك پیشاندەدەن کە بەتەواوی لە دەمی ڕابردوودا ڕووی داوەو کۆتایی هاتووە، ئەم جۆرەش ناو دەنێین (ڕابردووی نزیك).

لە ڕستەی (بەهار درەنگ بوو، هەوا گەرم ببوو ، بەڵام بەفر ئارەقیشی نەدەکرد) کارەکانی (گەرم ببوو، ئارەقیشی نەدەکرد) دووکاری ڕابردوون، بەڵام لە ڕووی دەمی ڕوودانیان لە ڕابردوو جیاوازییان هەیە، کاری (گەرم ببوو- گەرم بوو بوو) کارێکە ئیشێك پیشاندەدات، کە دەمی ڕوودانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژی بەر لەکاتی ئاخافتن، بۆیە ناوی دەنێین (ڕابردووی دوور)، بەڵام کاری (ئارەقیشی نەدەکرد)، هەر چەندە ڕوونەدانی

کارێك لە ڕابـردوودا پیشـان دەدات، بـەڵام ڕوودانەکـە یـان (ڕوونەدانەکـە) هـەر بەردەوامە کاتێکی دیارکراو نییە، کە کۆتایی بە ڕوودانەکە بهێنی، بە واتـاییێکی دیکە ئیشەکە (لە ڕوودانو لە ڕوونەدان)دا هەر بەردەوامە ئـەو جـۆرە کـارە بـە کاری (ڕابردووی بەردەوام) ناو دەبریٚ.

لە ڕستەی (ڕۆژێك چوومە مزگەوت تەماشام کـرد پیرەپیاوێـك بـە تـەنیٚ لـە تەنیشت سۆبە ساردو سرەکە هەڵکورماوە). چەند کارێکی ڕابردوو هەیە، بـەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمان بێت کاری (هەڵکورماوە)یە، ئەو کارە ڕوودانی ئیشـێك لـە ڕابـردوودا دەخاتـە ڕوو، کـە شـوێنەوارو ئەنجامەکـەی هـەتا دەمێکـی نزیـك لەکاتی ئاخافتن هەر دەمێنێت، ئـەم جـۆرە کـارەش پێیـدەگوترێت (ڕابـردووی تەواو).

## دەستور:

**کاری ڕابردوو: کارێك یان ئیشێك ڕادەگـەیێنێت لـەکاتی ڕابـردوو، واتـە بـەر لەکاتی ئاخافتن. کاری ڕابردوو چوار دەمی هەیە:**

**١. ڕابردووی نزیك**

**٢. ڕابردووی دوور**

**٣. ڕابردووی بەردەوام**

**٤. ڕابردووی تەواو**

| ز | دەمەکان | نیشانە | کار | نیشانە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | رابردووی نزیك | - | هات | - |
| ٢ | رابردووی دوور | - | هات | بوو |
| ٣ | رابردووی بەردەوام | دە | هات | - |
| ٤ | رابردووی تەواو | - | هات<br>هێنا | ووە<br>وە |

## ڕاهێنانی (١)

١. ئەز چووم.
توو ............
ئەو ............
ئەم ............
هوین ............
ئەو ............

من چووم.
تۆ ............
ئەو ............
ئێمە ............
ئێوە ............
ئەوان ............

٢. من گرت.
تە............
وی ............
وێ ............
مە ............
وە ............
وان ............

من گرتم.
تۆ ............
ئەو ............
ئێمە ............
ئێوە ............
ئەوان ............

| | |
|---|---|
| ٣. ئەز هاتیمە. | من هاتووم. |
| تو ........... | تۆ ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوە ........... |
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٤. من گرتییە. | من گرتوومە. |
| تە ........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |
| وە ........... | ئێوە ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا کارە ڕابردووەکان دەربهێنەو دەمەکانیان دیاربکە:

١. کە چووم باوکم نووستبوو.

٢. هەتا نهۆ هەڤالێ من نەهاتییە.

٣. ئازادم دیت لە پەرتوکخانەدا دەیخوێند.

٤. وێ بازنێ زێڕ کڕی.

٥. کە هاتم، ئەو نانی دەخوارد.

## ڕاهێنانی (٣)

| | |
|---|---|
| ٥. ئەز هاتبووم. | من هاتبووم. |
| تو ........... | تۆ ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوە ........... |
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٦. من گرتبوو. | من گرتبووم. |
| تە ........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |

| | |
|---|---|
| وه ........... | ئێوه ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |
| ٧. ئەز دهاتم. | من دەهاتم. |
| تۆ ........... | تو ........... |
| ئەو ........... | ئەو ........... |
| ئەم ........... | ئێمە ........... |
| هوین ........... | ئێوه ........... |
| ئەو ........... | ئەوان ........... |
| ٨. من دگرت. | من دەمگرت. |
| تە ........... | تۆ ........... |
| وی ........... | ئەو ........... |
| وێ ........... | |
| مە ........... | ئێمە ........... |
| وە ........... | ئێوه ........... |
| وان ........... | ئەوان ........... |

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. **سیروانی نامە نڤیسییە.**

٢. **نازدارێ وانە خاند.**

٣. **باوان نووستبوو.**

## ب. كاری ڕانەبردوو

کاتی ئێستا — کاتی داهاتوو

**مامۆستای زانست لە باسی (ئاو)دا گوتی:**

**( ئاو ژێدەرو سەرچاوەی ژیانە، مرۆڤ و جانەوەرو ڕووەك بەهۆی ئاوەوە دەژین، سێ بەشی گۆی زەمین بە ئاو داپۆشراوە، ئێستا گرفتی کەمی ئاو ولاتان نیگەران دەكات، لەبەر ئەوە دەسەلاتدارانی ولاتان بیر لەوە دەكەنەوە، كە ئەو گرفتە چارەبكەن، لە پاشەڕۆژدا ئاڤ دەبێتە هۆكارێكی بەهێز بۆ ڕێكخستنی پەیوەندی لە نێوان میللەتانی جیهان، ئاو سەرچاوەی بەدەستخستنی وزەی كارەبایە، پشكا هەرە زۆری وزەی كارەبای هەرێمی كوردستان لە هەردوو بەنداوی دوكان و دەربەندیخان دهێتە بەرهەمهێنان، پاش چەند ساڵێكی دیكە لە بەرهەمهێنانی وزەدا، ئاو جێی نەوت دەگرێت، لێ مخابن ئاوی كوردستان بە فیرۆ دەچێت، ئەگەر كوردستان ژی خودانا بڕیارێ خۆ بووبا، ئەو سامانە گرنگە سوودی بۆ گەلی كورد دەبوو).**

## خستنەڕوو:

ئەگەر بە سەرنجەوە ئەو باسە بخوێنینەوە، دەبینین ژمارەیەك كاری تێدایە، كە ڕوودانی كردەوەیەك نیشاندەدەن، كە لەكاتی ئاخافتن یان لە پاش كاتی ئاخافتن ڕوودەدات، دیارە ئەو كارەی ئیشێك دەردەخات، كە لەگەڵ ئاخافتندا ڕوودبدات پێی دەگوترێت كاری ڕانەبردوو بۆ كاتی (ئێستا)، ئەوەی كە ئیشێك دەردەخات لە دوای كاتی ئاخاوتن ڕووبدات، ئەوەیان پێی دەگوترێت كاری ڕانەبردوو بۆ كاتی (داهاتوو).

بۆ نمونە:

لە ڕستەی (ئاو ژێدەرو سەرچاوەی ژیانە، مرۆڤ و جانەوەرو ڕووەك بەهۆی ئاوەوە دەژین).

دەبینین كاری (دەژین) كردەوەیەك پیشاندەدات، كە لەكاتی ئێستادا ڕوو دەداتو ئەو جۆرە پێی دەگوترێت كاری ڕانەبردوو.

بە هەمان شێوە ڕستەی ( ئێستا گرفتی كەمی ئاو وڵاتان نیگەران دەكات) ئیشێك پیشاندەدات، كە لەكاتی ئاخافتندا ڕوودەدات بۆیە پێیدەگوترێ كاری ڕانەبردووی ئێستا.

بەڵام ئەگەر لە ڕستەی (ئاڤ دێ بیتە هۆكارێكی بەهێز بۆ ڕێكخستنی پەیوەندی لەنێوان میللەتانی جیهان) وردبینەوە، دەبینین كاری (دێ بیتە) كردەوەیەك پیشاندەدات، كە تا كاتی ئاخافتن ڕووینەداوە، بەڵكو ڕوونەدانەكەی دەكەوێتە پاش كاتی قسەكردنەكە، بۆیە پێیدەگوترێ كاری ڕانەبردووی داهاتوو.

هەروەها لە ڕستەی (پاش چەند سـالێکی دی لـە بەرهـەمهێنانی وزەدا، ئـاو جێی نەوت دەگرێت).

کاری (دەگرێت) لە شێوەدا وەکو کارێکی ڕانەبردووی کاتی ئێستایە، بـەلام لە واتادا بەهۆی هاوەڵکاری (پـاش چـەند سـالێکی دیکـە)وە، ڕوودانـی ئیشـێك پیشاندەدات، کە دەکەوێتە پاش کاتی ئاخافتنـەوە، هـەر بۆیـە بـەم جۆرەیـان دەگوترێ کاری ڕانەبردووی داهاتوو.

## دەستور:

**کاری ڕانەبردوو کردەومیەك پیشاندەدات یان لە کاتی ئاخاوتندا ڕوو دەدات و ئەو کاتە پێیدەڵێن: (ڕانەبردووی کاتی ئێستا)، یان لـەدوای ئاخـافتن ڕوودەدات، ئەو کاتە پێی دەڵێن:( ڕانەبردووی کاتی داهـاتوو)، کـە لـە شـێوەدا هـەردووکیان لە کرمانجی خواروو لەیەك دەچن، تـەنیا هاوەڵکـاری کـاتی جودایـان دەکاتـەوە، وەك:**

**دەچـــــــم بـۆ لادێ.**

**ئێستا دەچـــم بۆ لادێ.**

**سبەینێ دەچم بۆ لادێ.**

**بەلام لە شێوە زاری کرمانجی ژووروودا نیشانەی (دێ) دەخرێتە پـێش کـارە ڕانەبردووەکە، بۆ ئەوەی ببێتە ڕانەبردووی کاتی داهاتوو، وەك:**

**ئەز نهۆ دچم بۆ دهۆکێ. (ئیستا)**

**ئەز سبەهی دێچم بۆ دهۆکێ. (داهاتوو)**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم نووسینە بخوێنەوەو ئینجا هەرچی کاری ڕابردوو هەیە بیانکە بە ڕانەبردوو:

(( هاوین بوو، هەوا ئەوەندە گەرم ببوو کەس نەیدەتوانی تا ئێوارەیەکی درەنگ دەربکەوێت، میوەی هاوینە پێگەیشتبوو، بەڵام گەرما بەشێکی زۆری درەختی میوەی زەرەرمەند کردبوو، ڕۆژێکیان برادەران بڕیاریاندا بچین بۆ هاڤینگەها سوارەتووکەی، بە ئوتومبێل چووین، ئاوو هەواکەی فێنك بوو، تا ئێوارە ماینەوە. مە ڕۆژەکا زۆر خۆش دوور لە گەرما ب ڕێکر، ئاوی ساردی ئەو هاڤینگەهە دەروونی هەموومانی فێنك کردەوە)).

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم کارە ڕانەبردووانە لە ڕستە بەکاربێنە:

(دەخوێنم، دنڤیسین، دخوینم، دێچن، دەکێلێت، دروستدەکەن)

## ڕاهێنانی (٣)

١.شلۆڤەکردن:

کۆتری سپی جوانە.

کۆتر: ناوە، گشتییە، دیارخراوە، نیهادە.

ی: ئامرازی دانەپاڵە.

سپی: هاوەڵناوە، دیارخەری ناوی (کۆتر)ە.

جوان: هاوەڵناوی چۆنیەتییە، تەواوکەری کاری (ە)ی ناتەواوە.

ە: کاری ناتەواوە ڕانەبردووە بۆ کاتی (ئێستا).

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

ئـ– ڕزگار وانێ دخوێنێت.

ب– بەیانی دەچین بۆ پیشانگەکە.

پ– منداڵەکە ئێستا دەخەوێت.

## پ. کاری داخوازی

**لەوانەی زانستدا، مامۆستاکەمان گوتی:**

**( قوتابینە، بۆ ئەوەی لەشتان دروست بێت، پتەو و بەهێزبن هەموو شەوێك زوو بنوون، بەیانیان ژی زوو لە خەو ڕابن، دەم‌و چاوتان بە ئاوو سابوون بشۆن، ئینجا نانی بەیانی بخۆن، جلك‌و بەرگتان لەبەر بکەن‌و بڕۆن بۆ قوتابخانە.**

**ئەی قوتابی، لە کاتی دیاری کراودا، لە پۆلەکەت ئامادەبە، گویْ لە مامۆستا بگرە، دگەل هەڤالێن خۆ نە ئاخڤە، تەماشای ئەملاو ئەولا مەکە، کە تـەواو بـووی یەکسەر هەڕە مال، پشتی پشوودان‌و حەسانەوە وانەکانت بخوێنە، ئـەرکی ماڵـەوە بنڤیسە، کات بەفیڕۆ مەدە، هەڤالینیْ دگەل مرۆڤێن خراپ نەکە).**

## خستنەڕوو:

دیارە قوتابیو خوێندکاری ژیرو هۆشمەند دەبێت ئامۆژگاری مامۆستایان لەگوێ بگرن، بۆیە مامۆستای زانست ڕووی لە قوتابییانی کردو هەندێك ئامۆژگاری کردن، بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن.

مامۆستای زانست جارێك ڕوو لە هەموو قوتابییان دەکات و پێیاندەڵێت:

١. هەموو شەوێك زوو بنوون، بەیانییان ژی زوو لە خەو ڕابن. جارێکیش ڕوو لە تاکە تاکەیان دەکات و پێیان دەڵێت:

٢. ئەی قوتابی، لەکاتی دیاریکراو لە پۆلەکەت ئامادەبە، گوێ لە مامۆستا بگرە.

لە ڕستەی یەکەمدا مامۆستا داوا لە قوتابییان دەکات کارێك لە دوای ئاخافتن ئەنجام بدەنو کارەکەی خستۆتە شێوەی داواکردن یان داخوازی یان فەرمان پێکردن، دیارە قوتابیانیش، کە (کەسی دووەمی کۆ)ن داخوازییەکەی مامۆستایان جێبەجێدەکەن.

لە ڕستەی دووەمیش بە هەمان شێوە ڕوو لە قوتابییەك دەکات، کە (کەسی دووەمی تاکە)و داوای لێدەکات، کە لەکاتی دیاریکراودا لە پۆل ئامادەبێتو گوێ لە مامۆستا بگرێت، دیارە ئەنجامدانی ئەو کارەش لەلایەن قوتابییەکە دەکەوێتە پاش ئاخافتنەکەی مامۆستاو هەر لەبەر ئەوەش ئەم جۆرە کارە پێیدەگوترێت کاری داخوازی.

دیسان لە هەردوو ڕستەی (دگەل هەڤالێن خۆ نەئاخڤە)و (تەماشای ئەملاو ئەولا مەکە)، مامۆستا داوا لە قوتابی دەکات، کە کارەکە ئەنجامنەدات، چونکە ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانە بە خراپ دەشکێنەوە سەر قوتابی، ئەو جۆرە کارانە ژی هەر کارێت داخوازین، بەڵام لە دۆخی نەرێدان، کە بە ئامرازی (مە) لە شێوەزاری کرمانجی خواروو، (نە) لە شێوەزاری کرمانجی ژووروو دروستدەکرێن.

## دەستور:

**کاری داخوازی، کەسی یەکەم داوا لە کەسی دووەمی تاكو کۆ دەکات بۆ ئەنجامدانی یان ئەنجام نەدانی کارێك کە لەدوای ئاخاوتن ئەنجام دەدرێ.**

**١. کاری داخوازی بەنیشانەی (ب) دەست پێ دەکاتو بە جێناوی لکاوی (ە) بۆ کەسی دووەمی تاك وجێناوی لکاوی (ن) بۆ کەسی دووەمی کۆ کۆتایی دێت. وەك:**

**بنووسە ⟵ دووەمی تاك**

**بنووسن ⟵ دووەمی کۆ**

**٢. بەڵام لە هەندێك کاردا کە ڕەگەکانیان کۆتاییان بە بزوێنی وەکو (ۆ- وو- ێ- ی- ە) دێ.**

**لە کەسی دووەمی تاکدا بزوێنی (ە) دەرناکەوێت، وەك: (بخۆ، بڕۆ، بشۆ، بنوو، بدروو، بڵێ، دابنێ، بژی، بگری، دابخە)**

## ڕاهێنانی (١)

کاری ئەم ڕستانە لە دۆخی (ئەرێ)وە بگۆڕە بە (نەرێ):

١. درەنگ بخەوە.

٢. بچن بۆ مەلەکردن.

٣. یارمەتی ئەم پیاوە بدە.

٤. نان زۆر بخۆن.

٥. لاقێن بنقە.

٦. زەڤی بکێڵن.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم دێرە هۆنراوانە هەرچی کاری داخوازی هەیە دەستنیشانی بکەو بینووسەوە:

١. لە خەو هەستن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەمووو تاریخی عالەم شاهیدی فەزلو هونەرتانــــــە. (ئەحمەد موختار جاف)

٢. ئەی باڵندەی هەستم بە گوڕ

بفڕە بۆ ناو بلێسەو گــــــڕ. (گۆران)

٣. ئەی کچێ ڕابە بخوێنە داتو سەربەست هەر بژی

زوو ژ خەو تو سەر هلینە، بەس بمینە بێ مــــژی. (جگەرخوێن)

### ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتا |
|---|---|
| سەر هلینە | سەر بەرز بکەوە |
| بێ مژی | بێ مێشك |

**پێشەکییەکی مێژوویی:** ((کوردەکان بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام خاوەنی ئەلفبێیەکی تایبەتی خۆیان بوونو بە قسەی زانای بەناوبانگی کورد مامۆستا (بلەچ شێرکۆ) کورد پێش هاتنی ئیسلام لە چەپەوە بۆ ڕاستو بە ئەلفبێیەکی سەربەخۆی خۆیان زمانەکەی خۆیانیان دەنووسی، بەلاّم لە دوای ئەوەی ئایینی ئیسلام لەناو کورد بلاّوبۆوە، کورد وازی لەو ئەلفبێیە تایبەتییەی خۆیان هێناو کەوتنە سەر نووسین بە پیتی عەرەبی، زۆر لە مێژوو نووسان لەو باوەڕەدان، کە کوردەکان بە ٢٨٠٠ سالّ پێش زایین خاوەنی ئەلفبێی تایبەتی خۆیان بوون، بەلاّم دوای موسلّمان بوونیان وازیان لە نووسین بە زمانەکەی خۆیان هێناو پەنایان بردە بەر زمانەکانی: عەرەبیو فارسیو تورکییەوە، بەتایبەتی زمانی عەرەبی، کە زمانی قورئانی پیرۆزو دوو زمانەکەی تریش زمانی دەسەلاّت بوون، بەلاّم لەگەلّ ئەمەشدا لەولاو لەملادا کورد جاروبار نووسینی ئەدەبیو ئایینی و تەنانەت زمانەوانیشیان بە کوردی بەلاّم بە ئەلفبێی عەرەبی نووسیوە، باشترین نمونەش هۆنراوەکانی بابەتایەری هەمەدانیو عەلی حەریریو فەقێی تەیرانو بێسارانیو ئەوانی تر بوون.

زۆر لە ڕۆژهەلاّتناسەکان لەبارەی زمانو نووسینی کوردییەوە شتیان نووسیوە، قەشە (گارزۆنی) ئیتالّیایی لە ڕێزی پێشەوەی ئەوانەوە دێت، ئەو قەشەیە لە سالّی (١٧٨٧)ز کتێبێکی لەبارەی ئەلفبێی کوردییەوە لە چاپ دا، لەپاش ئەویش چەند ڕۆژهەلاّتناسێکی تر کاری لەم جۆرەیان کردووە، وەکو (ئۆگست ژاپا) کە فەرهەنگێکی کوردی– فەرەنسی بە خەتی فارسی لە سالّی(١٨٧٩)ز چاپکرد.

گـرنگترین کـاری ئـەم بـوارە کتێبەکـەی (یوسـف زیائـەدین) بـوو کـە لـە (١٨٩٢)ز نووسـراوە، پـێش ئـەویش مـەلا مـەحمودی بایەزیـدی لـە سـاڵانی (١٨٥٨– ١٨٥٩) ئەلفبێیەکی بـە پیتـی عـەرەبی بـۆ نووسـینی زمـانی کـوردی دانا، لەو نووسراوەدا مەلا مەحموود هەوڵیداوە شـێوەی هەنـدێك پیـت دروسـت بکات کە لە عەرەبیدا نین، وەك:( پ، چ، گ، ڤ، ژ... هتد).

یەکەم پەرتوکی ئەلفبێ لە ساڵی (١٩٠٩)ز لە ئەستانبۆڵ دەرچـووە بـەناوی (ئەلفبای کرمانجی). هەر لەم بوارەدا کۆمەڵەی (هێڤی) کە لەساڵی (١٩١٢)ز لـە ئەستانبۆڵ دامەزرا، ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێشخستنی ئەلفبێی کـوردی بـە پیتی عەرەبی، ئەو کۆمەڵـە دوو گۆڤـاری بـەناوەکانی (ڕۆژی کـورد)و (هـەتاوی کورد) دەرچوواند، هەر لەسەر لاپەڕەکانی ئـەم دوو گۆڤـارەدا بانگەشـەکرا کـە ئەلفبێی کوردی لە پیتی عەرەبی بگۆڕدرێت بۆ پیتی لاتینی.

لـە کوردسـتاندا، سـەرەتا ڕۆشـنبیرە کوردەکـان ئەوەنـدەی گرنگییـان بـە کێشــە سیاسـییەکان دەدا، ئەوەنـدە بــەلای پرســی ئــەلفبێی کوردییــەوە نەدەچـوون، بـەڵام ئینگلیزەکـان لـە سـاڵانی بیسـتی سـەدەی بیسـت هـانی ڕۆشنبیرانیان دا، تـا ئاوڕێـك لـە پرسـی ڕۆشـنبیری کـوردی بدەنـەوە، لەسـاڵی (١٩١٨)ز مێجەرسۆن ڕۆژنامـەی (تێگەیشـتنی ڕاسـتی) لـە بەغـدا دەرکـرد، کـە ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە پێشخستنی زمانو نووسـینی کـوردی، دوای سـاڵی (١٩٢٥)ز چەند ڕۆژنامەو گۆڤارێك دەرچوون، کە گرنگیـان بـە ئـەلفبێی کـوردی دەداو ڕونـاکبیری وەك تۆفیـق وەهبـیو ئیسـماعیل حـەقی شـاوێس، تیایانـدا دەنووسی.

هەر لەم بوارەدا، بیرۆکەی گۆڕینی پیتە عەرەبییەکان بە پیتـە لاتینییـەکان لەناو کورد پەیدابوو، کۆمەڵەی هێڤی هەر لە ساڵی(١٩١٣)دا ڕۆڵێکـی سـەرەکی لەم مەسەلەیەدا دەگێڕا، هەروەها مێجەرسۆنی ئینگلیزیش هەر لەو ساڵەدا واتە لـە( ١٩١٣) دا نامیلکەیـەکی لـەبارەی ئـەلفبێی کـوردیو هەنـدێ مەسـەلەی ڕێزمانی دانا.

دواجـار هەوڵـەکانی مـیر جـەلادەت بـەدرخان سـەریان گـرتو ئـەو زانایـە ئەلفبێیەکی لاتینی دانا کـە لەگـەڵ دەنگـەکانی زمـانی کوردیـدا بگونجێـتو لـە ساڵی ١٩٣٢دا بڵاوی کردەوەو پاشان ژمارەکانی گۆڤاری (هاوار)ی لە دیمەشـق پێ چاپکرد. میر جەلادەت تا مرد هەر لەم بوارەدا کاریدەکرد.

## ئەلفبێی کوردی بە پیتی لاتینی:

پیتەکانی ئەلفبێی کوردی بە پیتی لاتینی دەکرێن بە دوو کۆمەڵ:

ئـ- کۆمەڵەی یەکەم پیتە بزوێنەکانن، کە ژمارەیان (٨) هەشت پیتە.

| ز | پیتە لاتینییەکان | پیتی عەرەبی | ناوی پیتەکە | نمونە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | a- A | ا | ئا | Aw, - mar- Agir |
| ٢ | e- E | ـە (ە) | ئە | Pel- Ew- Derman |
| ٣ | u- U | و | ئویی کورت | Kurd- Gul |
| ٤ | û- Û | وو | ئویی درێژ | Dûr- Sûr |
| ٥ | o- O | ۆ | ئۆ | Do- Zor |
| ٦ | î- Î | ی | ئیی کورت | Yarî- Sîr |
| ٧ | ê- Ê | ێ | ئێ | Hêlke – Ême |
| ٨ | i- I | بزرۆکە | بزرۆکە | Dil- Bizin |

ب- کۆمەڵەی دووەم پیتە نەبزوێنەکانن کە ژمارەیان (٢٨) پیتە:

| ز | پیتە لاتینییەکان | پیتی عەرەبی | ناوی پیتەکە | نمونە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | b- B | ب | بێ | Baran- Kebab |
| ٢ | p- P | پ | پێ | Par- Pepule |
| ٣ | t- T | ت | تێ | To- Pertuk |
| ٤ | c- C | ج | جێ | Tac- Cacim |
| ٥ | ç- Ç | چ | چێ | Çaw- Çêí |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ĥewt- Ĥelwa | حیٚ | ح | ĥ- Ĥ | ٦ |
| Xew- Xurma | خیٚ | خ | x- X | ٧ |
| Dar- dest | دیٚ | د | d- D | ٨ |
| Beraz- Ker | ڕیٚ | ر | r- R | ٩ |
| Ŕûbar- Ŕeng | ڕێی قەڵەو | ڕ | ŕ- Ŕ | ١٠ |
| Zê- Zeng | زیٚ | ز | z- Z | ١١ |
| Jin- Jeng | ژیٚ | ژ | j- J | ١٢ |
| Sêw- Mast | سیٚ | س | s- S | ١٣ |
| Şêr- Şew | شیٚ | ش | ş- Ş | ١٤ |
| E'lî, A' dil, u'mer, le'lî, ni'met | دەخرێتە سەر نەبزوێنەکە ع عەین | | ' | ١٥ |
| X̂ardan- X̂em | غیٚ | غ | x̂ – X̂ | ١٦ |
| Kef- Fênik | فیٚ | ف | f- F | ١٧ |
| Mirov- Çav | ڤیٚ | ڤ | v- V | ١٨ |
| Qaz- Boq | قیٚ | ق | q- Q | ١٩ |
| Kew- Pak | کیٚ | ك | k- K | ٢٠ |
| Gurg- Deng | گیٚ | گ | g- G | ٢١ |
| Mil- mel | لیٚ | ل | l- L | ٢٢ |
| Maĺ- Diĺ | ڵیٚ | ڵ | ĺ- Ĺ | ٢٣ |
| Dem- Masî | میٚ | م | m- M | ٢٤ |
| Nok- min | نیٚ | ن | n- N | ٢٥ |
| Hewir- Hîwa | هیٚ | هـ | h- H | ٢٦ |
| Wane- Aw | ئوی نەبزوێن | و | w- W | ٢٧ |
| Yarî- heyv | ئی نەبزوێن | ئی | y- Y | ٢٨ |

## ڕاهێنانی (١)

ئەم پەیڤانە بە پیتی لاتینی بنووسە:

(چیا، کوردستان، چەم، جوانی، ڕۆژگار، ئازادی، گۆران، هەندرێن، دهۆك، زاخۆ، سەردان، دیاری، وێنە، یانە، سەرکەوت)

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانە بە پیتی لاتینی بنووسەوە.

١. زستانی کوردستان زۆر ساردە.

٢. ئازادی کوڕێ وی ل زانکۆیا دهۆکی دخوینیت.

٣. مەلایێ جزیری هۆزانڤانەکێ بناڤ و دەنگە.

٤. سلێمانی پایتەختی ڕۆشنبیری کوردستانە.

٥. کەرکوك بەشێکە لە هەرێمی کوردستان.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم پارچە نووسینە لە ئەلفبێی عەرەبی بگۆڕە بۆ سەر ئەلفبێی لاتینی:

(لە پاش ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ هەرێمی کوردستان گۆڕانێکی زۆری بەخۆوە دیتووە، ئەڤ هەرێمە لە پێنج پارێزگا پێکدێت، هەولێرو سلێمانیو کەرکوكو دهۆك و هەڵەبجە، چەند قەزاییێکی دیکەش هەن کە بەشێکن لەم هەرێمە وەك خانەقینو شەنگارو بەدرە، کۆمەڵی کوردەواری لە گەلێك لایەنەوە پێشکەوتووە، لەبەر ئەوە پێویستە ئەزموونی دیموکراتی کوردستان بپارێزین).

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم هۆنراوەیە لە ئەلفبێی لاتینییەوە بگۆڕە بۆ سەر ئەلفبێی عەرەبی:

## *Pêşmerge*

**ŕeng û dengê azadiyê**
**Xeml û Xweşîya  çelingiyê**
**Bazê çiya û zinaran**
**Kulîlka deşt û zozanan**
**Ŕonîya berbangan**
**Sorîya asoyan**
**Pêşmerge me**
**Çavkanî û lehîya azadîme**
**Dadikevim ji Çiya û geliyan**
**Digeŕim li deşt û newalan**
**Gund û bajar warên minin**
**Azadî û serxwebûn armanca minin**

(Serdar Ŕoşan)

**تێبینی: مامۆستا دەتوانێت نمونەی زیاتر لەم بارەیەوە بە قوتابییان بدات.**

# بەشی ئەدەب

١. قانیع
٢. جگەرخوێن
٣. بەختیار زێوەر
٤. سەلام
٥. ئەحمەد موختار جاف
٦. هێمن
٧. ئەحمەدێ نالبەند
٨. مەلا ئەنورێ مایی
٩. عەبدولواحید نوری
١٠. ئیبراهیم ئەحمەد (بلە)

# قانیع

## (١٨٩٨-١٩٦٥)ز



قــــانیع نــــاوی موحەمــــەدە کــــوڕی شــــێخ عەبدولقادری شێخ سەعیدی دۆڵاشی مەریوانە. لـە پازدەی ئەیلولی ساڵی (١٨٩٨)ز لە گوندی ڕیشێن لە دایك بووە، قانیع لـە تەمـەنی چل ڕۆژی دابـوو باوکی کۆچی دواییکردووە، لە تەمەنی دوو سـاڵان دایکیشـی کۆچـی دوایـی کـردووە، قـانیع هـەر لـە منداڵییەوە تووشـی دەربـەدەری بـووە، هـەر لـەو کاتــەوە تێکــەڵ بــە ئــێش و ئــازارو برســییەتی نەتەوەکــەی بــووە. بــەهۆی خزمێکییەوە دەچـێتە حـوجرەی مزگـەوت و دەسـت بـە خوێنـدن دەکـا. بـەناو دێهاتەکانی مەریواندا بۆ خوێندن گەڕاوە، پاشـان کەوتـە گـەڕان بـە شـارەکانی کوردسـتان بـۆ خوێنـدن وەك: (سـەقزو بانـەو سـابڵاخ و بۆکـان و شـنۆو کۆیـەو هـەولێرو کـەرکوك و سـولەیمانی و هەڵەبجـەو پێنجـوێن و سـنەو بیـارە)و چـەند جێگایەکی تر گەڕاوە.

ناسـراوییەکی تـەواوی لەگـەڵ بنەماڵـە ئایینییـەکانی کوردسـتاندا هـەبووە. بەتایبەتی لەگەڵ (شێخ مەحمودی نەمر). هەروەها لە خزمەت مـەلای گـەورەدا لە کۆیە خوێندوویەتی. بەهەر جۆرێك بێت خوێنـدنی مەلایـەتی تـەواو کـردووە. لە کۆماری مەهاباد کاربەدەستی پەروەردەکردن بووە. تا خۆی لـە ژیانـدا بـوو دیوانـەکانی (گوڵاڵـەی مـەریوان، باخچـەی کوردسـتان، چـوار بـاخی پێنجـوێن،

شاخی هەورامان، دەشتی گەرمیان)ی بڵاوکراوەتەوە. لە ١٩٦٥/٥/٧ز دا لە گوندی (لەنگەدێ) لە ناوچەی شلێر کۆچی دواییکردووەو هەر لەوێ نێژراوە. پاش مردنیشی لە ساڵی (١٩٧٠)ز (پاش مەرگەی قانیع) بڵاوکراوەتەوە.

لە ساڵی (١٩٧٤)ز بە شێك لە شیعرەکانی بڵاوکراوەتەوە بەناوی (نامەی قانیع). هەروەها لە ساڵی (١٩٧٩) شیعرەکانی بڵاوکراوەتەوە بە ناوی (دیوانی قانیع).

قانیع لە سەرەتای شاعیرییەتیدا بە فارسی هۆنراوەی نووسیوە، چونکە زمانی فارسی لەو سەردەمەدا باوبووە، لە پاش هەستکردنی بە بیری کوردایەتی پیرۆز دەستیکردووە بە هۆنراوە گوتن بەزمانی پاکی کوردی، قانیع بە شاعیری وریایی لادێی کورد بەناوبانگە، شیعرەکانی خۆماڵیو ڕەوانن، لەسەرەتای هەڵگیرساندنی شەڕی دووەمی جیهان قانیع تێکەڵ بە ڕێبازی ئەدەبیی شۆڕشگێڕانە بووە. هۆنراوەکانی لە ڕووی مەبەستەوە سێ بابەتی گرتووەتەوە (دڵداری، کۆمەڵایەتی، نیشتمانپەروەری). قانیع لە سەرەتای ساڵی (١٩٦٣)ز بەهۆی باری ئاڵۆزی ناوچەکەوە لەگەڵ دانیشتوانی چەند دێیەکدا کۆچدەکەنو دەچنە ئەو بەری سنوورەوە. هەر ئەو شەوە دەیگرنو دەیبەن بۆ بەندیخانەی (قەجەر) لە تارانو ماوەیەك لە بەندیخانەدا دەیهێڵنەوە، لە کاتی ئەو بەندییەدا نەخۆشییەکەی زۆری بۆ دێنیو هیوا بڕاوی ژیان دەبێتو بەم جۆرە باسی بەندیخانەکەی دەکات:

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە

ئەم کەلەبچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە

زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرڕزڕەی زنجیر ئەکەم

سەیری ئەم زنجیرە کەن وەك زێوەری شاهانەیە

بووکی ئازادیم ئەوێ، خوێنم خەنەس بۆ دەستو پێ

ئەڵقە ئەڵقەی پێوەنم وەك پلپلەو لەرزانەیە

گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بەدیلی لاڵ ئەبم

باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابی خانەیە

گرتن‌و لێدان‌و کوشتن عاملی ئازادییە

تۆپو شەستیرو کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە

بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ

قوڕ بەسەر ئەو دوژمنە هیوای بە بەندیخانەیە

گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەلاَتە بۆ لەشم

نۆکەری‌و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە

چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکا

میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە

چەکی شۆڕشگێڕی من نووسین‌و بیرو باوەڕە

ڕاپەڕینە، هەڵمەتە پڕ نەعرەتەی کوردانەیە

"قانیع"م ئەمرۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم

سەد هەزار لەحنەت لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە

(سێ دێر لە سەرەتاوە بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| | | |
|---|---|---|
| کونجی بەندیخانەیە | : | سوچێکی تاریك لە بەندیخانە |
| زێوەری شاهانەیە | : | ئارایش‌و ڕازاندنەوەی مەلیکانەیە. |
| خەنەس | : | خەنەیە |
| پێوەنم | : | پێوەندم، کۆت‌و زنجیرێکە دەخرێتە پێی مرۆڤ |
| پلێلە | : | پارچە زێڕ یا زیوی بچووك کە بەخشلێکەوە بەندکرابێ. |
| لەرزانە | : | جۆرە خشڵ‌و زێڕێکە بۆ سەری ژن. |
| سابلاخ | : | مەهاباد |

## جگەرخوێن

(١٩٠٣-١٩٨٤)ز



ناڤێ وی (شێخ موس کوڕێ حەسەنی کوڕێ محەمەد)ە. لە ساڵی(١٩٠٣) لە گوندی (حەسار) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای بـاژێری (حەسەنکێف) لە کوردستانی باکوور لەدایکبووە.

جگەرخوین خۆی دبێژیت:

**سالا هەزارو نەهسەدو سێ ئەز هاتم دنیایێ**
**بناڤێ سوڵتان شێخ مووس ئەز چێ بوومە ژ دایێ**
**هەتا بووم سێزدە ساڵی لگوندێ مەی هەسارێ**
**ژینا خوە من بۆراند پاشی ژوێ مەدا ڕێ**

جگەر خوین هێشتا بچووك بوو بابی دەمرێ، لەگەڵ دایك‌و خوشك‌و برایێن خۆ بەرەو شاری (ئاموودە) چوون، لەوێ دایکیشی دەمرێت. لە ساڵی(١٩١٧) دەچێتە بەر خوێندن‌و لە ساڵی (١٩٣٢) تەواوی دەکات، ماوەییێك مەلایەتی کردەوە. دگەل کۆمەلەکا جوتیارێن کورد دچیتە پارچا دن یا جزیرێ لە سوریاو دوو گوندان ئاڤادکەن.

جگەر خوین پشکداری لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران کرییە، تێکشکاندنی شۆڕشەکە بە ئاواو شێوەیەکی دڕندانە کارێکی مەزنی کردە سەر هەستی نەتەوایەتی شێخ موس‌و برینێکی گەورەی لە دڵی ویدا پەیدا کرد،

لەوڕا ناسناڤێ خۆ کردە (جگەرخوین). پاش ئەم کارەساتە هەموو شیعری خۆی بۆ کوردستان تەرخانکرد.

خامەی خۆی کردبووە خەنجەر بۆ سینگێ دوژمنو زەنگ بۆ هوشیارکردنەوەی میللەت:

| | |
|---|---|
| **بەسە میللەت لتە شەرمە** | **هەتا کەنگی دخەو دابی؟** |
| **دبن دستێن نەیاران دە** | **هەژارو دیلو کۆلابی** |

پاش شۆڕشی ١٤ی تەموز ١٩٥٨ دهێتە عێراقو ماوەیێك لە ئێزگەی کوردی کار دەکات، ماوەیەکیش لە زانکۆی بەغدا لە کۆلێژی ئاداب- بەشی کوردی- دەبێتە وانەبێژ.

زۆربەی هەڵبەستێن وی دەربارەی خەباتی نەتەوایەتیو خەباتی جوتیاری کوردە. هەر لەم ڕێگایە گەلێك گرتنو بەندییو ئازارو ئەشکەنجەی دیوە. لە ١٩٨٤/١٠/٢٢ لە (ستۆکهۆڵم)ی پایتەختی سوید دلێ مەزنی ژ لێدانێ دەوەستیتو لە باژێری (قامشلۆ) لە کوردستانی سوریا دهێتە ڤەشارتن.

## بەرهەمەکانی:

١. هەڵبەست: أ- بریسكو پێتی ب- سەورا ئازادی ج- کیمە ئەز

د- ڕۆناك ه- زەند ئاڤێستا و- شەفەق ز- هێڤی

٢. چیرۆك: أ- جیمو گول پەری ب- ڕەشۆییێ داری ج- سالارو میدیا

٣. زمانو ڕێزمان:

ئـ- گۆتنێن پێشیان ب- ئاواو دەستورا زمانێ کوردی

پ- فەرهەنگا کوردی بەرگێ (١- ٢)

٤. چەندین بەرهەمی تری نووسیبوو، پاش مردنی چاپکران وەك:

ئـ- ئاشتی (هەلبەست) ب- تاریخا کوردستان بەرگێ (١- ٢)

ت- فۆلکلۆری کوردی پ- ژینە نیگەریا من

د - نڤیسارەك لەسەر دیباجا ئەحمەدێ خانی

نمونەیێک لە هۆنراوەکانی:

## شام شەکرە، وەلات شیرنترە

(جگەرخوین)

وەڵاتێ من تویی بووکا جیهانی

هەمی باغو بەهەشتو مێرگو کانی

شەپالو شەنگو شۆخو نازو گەوری

گەلەك شیرینو ڕندو پڕ جوانی

سەرێ تاجا سەلاحەدینێ کوردی

ئەنی ڕۆژە دبرجا ئاسمانی

دوو بورهێن تە کڤانێ ڕۆستەمێ زال

دوو زولفێن تە ژتیرێن قەهرەمانی

ڕوویێ تە ئاگرێ زەردەشتو مەزدەك

ژتە هێستر شەرابا کامیرانی

دوو چاڤێن تە وەکی دەریایێ هورمز

کەپوو ئەلماسە کارێ مووشو وانی

دوو لێڤێن تە کتێبا حاجی قادر

زمانێ تە ژ بەندا شێخێ خانی

سەرو پا زەندو بازن تەڤ حەنینە

هەمی سۆرن ژ ڕەنگێ ئەرخەوانی

جگەر خوینە کوڕێ تە هەر دنالی

ژبەر ژانا نەزانیو خەزانی.

★★ ★★ ★★

لەسەرەتاوە سێ دێڕی بۆ ئەزبەرکردنە

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| | |
|---|---|
| ژینا خوە من بۆراند | ژیانم بەسەر برد |
| ئەز چێ بوومە ژدایێ | لەدایك بووم |
| پارچا دن یا جزیرێ | پارچە یا بەشەکەی تری جزیرە |
| لەورا | لەبەر ئەوە، بۆیە، لەبەرهەندێ |
| ناسناڤ | نازناو. |
| ڤەشارتن | ناشتن |
| تەموز | تیرمەهـ |
| شەپال | جوان، ڕند |
| بووکا جیهانی | بووکی جیهانی |
| پڕ جوانی | زۆر جوانی |
| ئەنی | هەنیە، نێو چاوان |
| دوو بورهێن تە | دوو برۆی تۆ |
| کڤان | کەوان |

# بەختیار زێوەر

(١٩٠٨-١٩٥٢)ز



ناوی ڕاستەقینەی (فایەق)ە کوڕی شاعیری بەناوبانگی کورد زێوەرە، لە ساڵی (١٩٠٨)ز لە شاری سولەیمانی لەدایکبووە. سەرەتا وەکو هەموو منداڵانی ئەو سەردەمە لە حوجرەی مزگەوتدا خوێندوویەتی، پاشان چووەتە قوتابخانەو پۆلی شەشەمی سەرەتایی تەواوکردووەو بووەتە فەرمانبەر.

لە ساڵی(١٩٤٦)ز کاتێ قوتابخانەی ناوەندی شەوان لە سولەیمانی کرایەوە، شاعیر بێ گوێدانە تەمەنو ئەرکی ژیانو پلەی کۆمەڵایەتیو شاعیرانەی، بووە بە قوتابیو لە ساڵی (١٩٤٨)ز پۆلی سێیەمی تەواوکردووە. هەر لەو ساڵەدا بەهۆی کۆچی دوایی باوکییەوە تەواو بە دەست نەخۆشییەکەیەوە، کە زووتر سەرەتای دیار بوو، پەرێشانو سەرگەردانبووە، تا لە ١٩٥٢/١٢/٣١ز کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی گردی (جۆگا) لە سولەیمانی لە تەنیشت باوکییەوە نێژراوە.

لە گەرمەی کێشەی سەختی ژیاندا خۆی ناو دەنێت (سەرکەوتوو) لە کۆڕی نەخۆشیو زامداریو کلۆڵیدا بەر چاوی تاریك نابێتو هیوای نابڕێت، ئازار بەسەرچاوەی دروستبوونی ژیانی بەختیارو سەرکەوتن دەزانێ، پاشان ناوی خۆی دەنێت (بەختیار).

بەختیار زێوەر بە تەواوی پەیڕەوی زێوەری باوکی کردووە، بەڵکو قوتابییەکی ژیرو پێشکەوتووی ئەوە لەپەیڕەوی زانستپەروەریدا. لەژێر باڵی ڕەشیی دواکەوتوویی‌و نەزانی‌و چەپۆکی داگیرکەردا شاعیری زانستپەروەر خوێندن‌و فێربوون‌و زانست بە چەکی ڕزگاربوون دادەنێت.

هۆنراوەکانی زیاتر نیشتمانپەروەری‌و دڵدارین، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی کۆمەڵێك سرودی جوان‌و بەناوبانگە، وەکو:

(چەند شیرینە لام، براییینە لەخەو هەستن، گۆیژە....)

## گوڵی سەربەستی

**گوڵێك شیرینتر لە خونچەی بەهار**
**نـازکتر، جوانتر، لە شەوبۆی نازدار**
**گـەشتر لە دیدەی وەنەوشەی نزار**
**گـوڵێکە نـاوی گوڵی سـەربەسـتی**
**مـەردە ئەو گەلـەی بگاتە دەسـتی**

★★ ★★

**گوڵی سەربەستی ئەی هێزی گیانم**
**ڕۆشـن کەرەوەی ڕێگەی ژیانـــــم**
**تۆم نەبێ، من خۆم بە هیچ نازانم**
**تـۆم نەبێ هەرگیز ناحەسێمــەوە**
**بـێ بۆنی خۆشت نابوژێمــــەوە**

★★ ★★

با تەنیا هەر تۆ شاگوڵی من بی
سەرچاوەی سۆزی بە کوڵی من بی
تۆ تاقە یاری پڕ دڵی من بی
شیعرت پیا هەڵدەم بە زوبانی خۆم
بڵێم دەمێکە بە دڵ شەیدای تۆم

(کۆپلەی یەکەم بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

سەربەستی : ئازادی
شیرینتر : جوانتر
شەوبۆ : جۆرە گوڵێکە بە شەو بۆنی خۆشە
دیدە : چاو، چاڤ
وەنەوشە : جۆرە گوڵێکی دەشتییەو گوڵەکانی بچکۆڵەن
نزار : نسێ
مەرد : پیاوە (ئازایە)
ناحەسێمەوە : ئۆقرە ناگرم، ئارام ناگرم، پشوو نادەم
تاقە : تاکە، ئێك
شەیدا : گێرۆدە
هۆز : خێڵ– عەشیرەت
نابوژێمەوە : ناگەشبم، ناگەشێمەوە
یار : دۆست، هەڤاڵ، هاوڕێ

# سەلام
## (١٨٩٢- ١٩٥٩)ز




سەلام کوڕی شێخ ئەحمەدی عازەبانییە، لە ساڵی(١٨٩٢)ز لە گوندی (عازەبان)ی ناوچەی وارماوەی سەر بە پارێزگای هەڵەبجە لەدایکبووە. زۆر ئارەزووی لە خوێندن هەبووە، لە تەمەنی چوار ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، قورئانو زمانی فارسی خوێندووە، لە تەمەنی شەش ساڵیدا باوکی کۆچی دواییکردووە. ئاگاداری ڕووداوەکانی یەکەم شۆڕشی (شێخ مەحمودی حەفید) لەساڵی(١٩١٩)ز بووە.

لە وەزیفەدا لە زۆر شوێن خزمەتیکردووە، وەك: وارماوە، هەڵەبجە، سلێمانیو تەنانەت بەسرەو بەغداو حیللەو هەندێ شوێنی تر. لە ساڵی(١٩٢٨)ز لەگەڵ چەند لاوێك (کۆمەڵەی زەردەشت) یان دامەزراند. لە ساڵی(١٩٣٠)ز دوای کارەساتی ڕۆژی ڕەشی (٦)ی ئەیلول لەگەڵ چەند کەسێك دەچنە گوندی (پیران) لای (شێخ مەحمود). هەروەها بەشداری ڕووداوەکانی ساڵی(١٩٣١)ز کردووە بە فەرماندەی (شێخ مەحمود). لە(١٩٥٤- ١٩٥٥)ز خۆی خانەنشین کردووە.

لە پێشەکی دیوانەکەیدا، کە لە ساڵی(١٩٥٨)ز لە بەغدا چاپکراوە، د. مارف خەزنەدار دەنووسێتو دەڵێت (سەلام زیاتر شاعیرێکی نیشتمانو

نەتەوەیە، چونکە کاتی گەنجی سەلام، نەتەوەی کورد بە دەورێکی تایبەت تێدەپەڕێت). لە بابەت شیعرە دەروونییەکانی دەڵێت (خەیاڵێکی ڕوونی تێدایەو شعورێکی ڕاست دەردەخا، وەکو وشەکانی لە ناخی دەروونیا بێنە دەرەوە وایە).

یەك لە شاکارەکانی شێخ سەلام چوارینەکانی (خەیام)ە، کە لە فارسییەوە بۆ کوردی وەریگێڕاوە، کە بەڕاستی گیانی خەیامی لە وەرگێڕانەکەدا بە تەواوی پاراستووەو بە یەکێك لە باشترین وەرگێڕانەکانی دادەنرێت، سەلام لە ساڵی(١٩٥٩)ز لە سلێمانی کۆچی دواییکردووەو لە گردی سەیوان نێژراوە.

**ئەمەش نمونەیەکە لە هۆنراوەکانی:**

## وەتەن چییە؟

**هەستە لە خەو ئەی لاوی کورد**
**تێبکۆشە بە دەستو برد**
**هاوار ئەکا دایکی وەتەن**
**وا گیان ئەدا، پیادا بگەن**
**خاكو گوڵو گوڵو گیا**
**شاخو چەمو چڵو چیا**
**ڕەنگاو ڕەنگیی کەژی سیا**
**هاوار ئەکەن بە جیا جیا**
**وا مەزانە خاکی وەتەن**

ئاو و گڵە دارو دەوەن
ئەم وەتەنە ئاو و گڵە
پشتو ئەژنۆ، جەرگو دڵە
ئەجدادی تۆ شێرانی کورد
لە ڕێی وەتەن بە مەردی مرد
مردن، ڕزین بوون بەم خاکە
وەتەن دایک، وەتەن باوک، وەتەن کاکە.

(سێ دێر لە سەرەتاوە بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| بە دەستو برد | : | بە گورجو گۆڵی |
| پیادا بگەن | : | پێی ڕابگەن، بگەهنێ |
| کەژ | : | چیا، شاخ |
| سیا | : | ڕەش |
| ئەژنۆ | : | چۆک |

# ئەحمەد موختار جاف

## (١٨٩٨-١٩٣٥)ز



ئەحمەد موختـار كـوڕی وەسمـان پاشـای گـەورەی عەشـیرەتی (جـاف)ە. لـە سـاڵی (١٨٩٨) لـە شـاری هەڵەبجـە لـە دایكبـووە، دایكیشـی (خـانمی وەسمـان پاشـا) یـەكێك بـووە لـە ژنـە نـاودارو هەڵكـەوتووەكانی كورد، لە تەمەنی حەفت ساڵیدا دەخرێتە بەر خوێندن، لە ساڵانی (١٩١٩- ١٩٢٤)ز قایمقـامی قـەزای هەڵەبجـە بووە، پاشان بووە ئەندامی پەرلەمانی عیراق.

ئەحمەد موختار دۆستو هەڤاڵی زۆربەی شاعیرو ڕۆشنبیرەكانی سـەردەمی خۆی بووە، وەك:(بێكەس، گۆران، سەلام، عەبدولواحید نـوریو زۆری تـر)، لـە هۆنراوەكانیـدا ڕێچـكەی نیشـتمانپەروەریو ئـەڤینی گرتـووە. سـەرەڕای هۆنراوەش، چیرۆكێكی هەیە بەناوی (مەسەلەی ویژدان)، كە لەساڵی (١٩٧٠)ز لە بەغدا چاپو بڵاوكراوەتەوە، لە ڕۆژی (٦)ی مانگی شـوباتی سـاڵی (١٩٣٥)ز لەسەر ڕوباری سیروان شەهیدكراوەو چۆتە ڕیزی نەمرانەوە.

نموونەیێک لە هۆنراوەکانی:

لـە خـەو هەڵسـن درەنگـە میللـەتی کـورد خـەو زەرەرتانـە
هــەموو تــاریخی عالــەم شــاهیدی فــەزڵو هونەرتانــە
دەسا تێکۆشـن ئـەی قـەومی نـەجیبی بێکـەس و مـەزلووم
بــە گورچــی بیــبڕن ئــەو ڕێگــە دوورە وا لــە بەرتانــە
بخـوێنن چـونکە خوێنـدن بـۆ دیفـاعی تیغـی دوژمنتـان
هەمـوو ئـانو زەمـانێ عــەیـنی قـەلغانو سـوپـەرتانە
بـە خـۆڕایی لـە دەسـتی بەرمـەدەن ئـەم خاکـە مەحبوبـە
کـە تـۆزی وەك جـەواهیر سـورمەو کـوحلی بەسـەرتانە
بەســەر خاکـا ئەگـەر نـازیش بکـەن حەقتانـە کوردینـە
تەماشــای ســێبەری ئــەو شــاخو کێــوە وا لەســەرتانە
بــەبێ قــەدری بەســەریا ڕامــەبوورن حورمــەتی بگــرن
گوڵاڵـە سـوورەی ئـەم سـەحرایە خوێنـاوی جگەرتانــە
دەمێکــە ئــەم وڵاتــە وا ئەســیری پەنجــەیی جەهلــە
لــە ســایەی عیلمــەوە ئــەمڕۆ ئــیتر نۆبــەی زەفەرتانــە
زوبـانی حـاڵی (ئەحمـەد) هـەر ئـەڵێ وریـابن ئـەی میللـەت
بـزانن بـەردی ئـەم شـاخانـە ئەلمـاسو گـەوهەرتـانـە

(سێ دێر بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| هەڵسن | : | هەستن، ڕابن |
| دەسا | : | دەی، زووکەن، خێراکەن |
| بە گورجی | : | بەخێرایی، بلەزی |
| تیغ | : | تیخ، کێرد، چەقوو |
| سورمەو کوحل | : | کل، جۆرە تۆزێکە چاوی پێ جوان دەکرێ |
| لە سایەی | : | لە سێبەری |

# هێمن

## (١٩٢١ - ١٩٨٦)ز



هێمن ناوی (سەید موحەمەد ئەمین)ە کوڕی سەید حەسەنی شێخولئیسلامی موکرییە، لە ساڵی (١٩٢١)ز لە گوندی (لاچین)ی نزیك شاری مەهاباد لەدایکبووە. لە تەمەنی منداڵیدا چۆتە بەر خوێندن، سەرەتا ئەلفوبێی لای مامۆستا (سەعید ناکام) خوێندووە، پاشان باوکی ناردوویەتی بۆ شاری مەهاباد بۆ ئەوەی لە قوتابخانەی دەوڵەتی بخوێنێت. لەوێ تا پۆلی چوارەمی خوێندووە، ئینجا باوکی ناردوویەتی بۆ قوتابخانەی ئایینی، لە خانەقای شێخی بورهان ماوەیەك ماوەتەوە، بەڵام خوێندنەکەی ڕێکوپێك نەبووە، دواتر لەلای هەندێك مەلای تر خوێندوویەتی.

لە ساڵی (١٩٤٢)ز کە کۆمەڵەی (ژ. ك)[١] دامەزرا، هێمن ئەندامێکی هەرە چالاکی ئەو کۆمەڵە بووە، لەسەردەمی (کۆماری کوردستان) لە مەهاباد دەورێکی دیاری هەبووە، دەنگی دلێری شیعرو نووسەری باڵادەستی ئەو کۆمارە بووە. لە ١٩٨٦/٤/١٨ز کۆچی دواییکردووەو لە مەهاباد گیانی بە خاك سپێراوە.

---

[١]- (ژ.ك): کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد، کە دواتر بووە بە حیزبی دیموکراتی کوردستان

هـێمن یەکێکـە لـە شـاعیرە بـەرزەکانی کـورد لـە سـەدەی بیسـتەمدا. هۆنراوەکـانی هـێمن هـەر لەسـەرەتاوە لـە چـوار چـێوەی شـاعیرو نووسـەران دەرچـووەو لـەناو خـەڵکی کوردسـتان بڵاوبۆتـەوەو لـە دڵـی هـەموو کـوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر جێی خۆی کردۆتەوە.

هـۆنراوەی شـاعیرە کلاسـیکییەکانی کـورد کاریـان تێکـردووە، بەتایبـەتی هۆنراوەی (نالی)، هەروەها هۆنراوەکانی گۆران کاریگەریان لەسەر هەبووە.

هەسـتی نیشـتمانپەروەریو جـوانی سروشـتی کوردسـتانو جـوانی ژن سەرچـاوەی ئیلـهامی شـاعیربوون. زمـانی ئـەدەبی لـە شـیعری هـێمن دا بـە کوردییـەکی ڕەوانو جـوانو پەتییـە، ئـەدیبو شـاعیران پێیـان خۆشـەو نەخوێندەواریش لێی تێدەگەن.

هێمن هەر شاعیر نەبووە، بەڵکو پەخشاننووسێکی هەڵکەوتوو بـووە وەکـو لە پێشەکییەکەی دیوانی (تاریکو ڕوون) دەردەکەوێت.

هێمن چیرۆکنووسێکی بەتوانا بووە. لە بەرهەمە چاپکراوەکانی دا (تاریکو ڕوون، ناڵەی جودایی، هەواری خاڵی، ڕێزی نان بگرن).

نمونەیەکە لەهۆنراوەکانی هێمن لە دیوانی تاریکو ڕوون:

## تـۆم هـەر لـەبیرە

لە شاییدا لە وەختی هەڵپەڕینا
لە خۆشیدا لەکاتی پێکەنینـــا
لە کۆڕی ماتەمو گریانو شینـا
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

بە شەو تاکو بە سەرما زاڵ دەبێ خەو
بەڕۆژ تاکو دووبارە دێتەوە شـــــەو
لە کاتێکدا کە دەدوێنم ئەمو ئـــەو
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

زەمانێکە کە دەچمە سەیری گوڵـزار
لەگەڵ پۆلی ڕەفیقانی وەفـــــادار
تەنانەت وەختی دەسبازی لەگەڵ یار
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

دەکەم تەرخان لە ڕێی تۆدا ژیانــم
لە سەنگەردا بەرەو ڕووی دوژمنانم
بە خاکی تۆ دەمی ئاویلکەدانـــــم
ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

(دوو کۆپلەی سەرەتا بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| | | |
|---|---|---|
| ماتەم | : | شین‌و شەپۆڕ، گریان |
| دەدوێنم | : | قسەی لەگەڵ دەکەم |
| پۆلێ | : | تاقمێك |
| وەفادار | : | ئەمەکدار |
| ئاویلکەدان | : | سەرەمەرگ، کاتی مردن |

# ئەحمەدێ نالبەند
## (١٨٩١-١٩٦٣)ز



هۆزانڤانی دەڤەری بادینان ناوی (ئەحمەد ئەمین نالبەند)ە بە (ئەحمەد موخلیس) دهێتە ناسین، لە ساڵی ١٨٩١ز لە گوندی (بامەڕنێ)ی سەر بە قەزای ئامێدی لەدایكبووە، لە تەمەنی شەش ساڵیدا دەستی بە قورئان خوێندن كردووە. بۆ خوێندن چووە بۆ:(ئامێدی، زاخۆ، دهۆك و گوندی بیدۆهێ لە دەڤەری بەرواری ژۆری)، ژیانێكی پڕ لە دەردە سەریو ناخۆشیو مشەختی بەسەر بردییە، پیاوێكی قسەخۆشو نوكتەبێژو زمانزان بووە.

زۆربەی شاعیرە كۆنەكان كارێكی زۆریان لە هزرو بیرو باوەڕی نالبەند كردووە بە تایبەتی (مەلایێ جزیری)، هەر لەبەر ئەوەش وەكو شاعیرە كلاسیكییەكان زمانێكی تێكەڵ لە عەرەبیو كوردی بەكارهێناوە.

نالبەندێ هۆزانڤان، هەڵبەستی بۆ ئەم مەبەستانە هۆنیوە، ئانكۆ ڤەهاندیە:

١. پێهەڵدانو پێهەڵگوتنو وەسفكردن، كە نالبەند دەستێكی باڵای لەو مەیدانەدا هەبووە.

٢. ئەڤینیو ئەڤینداری.

٣. سۆفیاتیو خوا پەرستی.

٤. هۆنراوەی کۆمەڵایەتی ئانکۆ جڤاکی، کە شێوەی گاڵتەو گەپ بەخۆوە دەگرێت.

٥. کرێتکردنو پیشاندانی بەرامبەرەکەی، دیارە لەو مەبەستە باڵادەست بووە.

٦. کوردینیو وەڵاتپارێزی.

نالبەندیێ هۆزانڤان لە (٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٦٣)ز کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی گوندی (خشخاشا) لە دەڤەری بەرواری ژۆری نێژراوە (هاتیە ڤەشارتن).

نمونەیەکە لە هۆنراوەکانی:

دوهــــی ســـــپێدێ ل ســـــەربانی
م جانـــەك دیـــت ژ خـــەو ڕابـــوو
ژ مـــــال دەرکـــــەت دەرێ خـــــانی
م تـــــەخمین کـــــر زولـــــەیخا بـــــوو
زولـــــەیخابوو ســـــفەت حـــــۆری
وەکـــــی تـــــیرێ ژمـــــە ڕابـــــۆری
چـــوو ســـەر ئـــاڤێ ل ڕەخـــێ ژۆری
وەکـــــی ڕۆژێ ل مـــــە ئاڤـــــا بـــــوو
دەمـــــا زڤـــــڕی ژ ســـــەر ئـــــاڤێ
م دیـــــت لێـــــدا شـــــەقا تـــــاڤێ
مقابـــــــل چـــــــوومە هنـــــــداڤێ
قـــــەرە پۆشـــــی گرێـــــدا بـــــوو
دەمـــــا تـــــــاڤێ ل بـــــــەژنێ دا
م دیـــــت شـــــبهی گـــــولا ســـــپێدا
وەســـا گـــەش بـــوو دنـــاڤ ڕێـــدا
چـوو حـال بـۆ کـەس نـەهێلا بـوو
نـــەهێلابوو بـــۆ کـــەس حالـــەك
دەقیقـــەك ل مـــن ببـــوو ســـالەك
ل ئـــــەنیا وێ هـــــەبوو خالـــــەك
خـــودێ حـــەق تـــازە کێشـــا بـــوو

(سێ دێری بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| | | |
|---|---|---|
| دوهی سپێدێ | : | دوێنێ سبەینێ، دوێنی بەیانی. |
| م جانەك دیت | : | من جوانێکم دیت. |
| ژ خەو ڕابوو | : | لە خەو هەستابوو. |
| وەکی تیرێ | : | وەکو تیر |
| دەما زڤڕی | : | کە گەڕاوە |
| شەقا تاڤێ | : | تیشکی هەتاو |
| چوومە هنداڤێ | : | چوومە لای |
| وەسا گەش بوو | : | وەها گەش بوو |
| لە ئەنیاوێ | : | لە هەنیەی ئەو، لە نێو چەوانیدا. |
| دەرێ خانی | : | دەرەوەی ماڵ یان خانوو. |
| ژمە ڕابۆری | : | بە پێشماندا تێپەڕی. |
| تاڤ | : | هەتا، خۆر. |
| مشەخەتی | : | ئاوارە |
| کرێتکردن | : | ناشیرنکردن |

# مەلا ئەنوەرێ مایی
# (١٩١٣-١٩٦٢)ز



مەلا ئەنوەرێ مایی، تۆرەڤانو مێژوونووسو هۆزانڤان بوو، نیشتمانپەروەرو کوردپەروەربوو، خەباتکارو جانفیدابوو. ناوی (ئەنوەر محەمەد تاهیر)ە لە ساڵی (١٩١٣)ز لە گوندی (مایێ) لە ناوچەی بەرواری ژۆری لەدایکبووە. تەمەنی دوو ساڵان بوو، کە باوکی کۆچی دوایکرد. تا تەمەنی دەبێتە شەش ساڵ هەر لە گوندی (مایێ) دەبێت، پاشان دایکا وی، ئەوی دنێرێتە گوندێ (بامەڕنێ) بۆ خوێندن، هەر لەو گوندە خوێندنی سەرەتایی بە دویماهی دینیت، بەڵام لەبەر دەستکورتی خوێندنی ناوەندی پێ تەواو نەکراوەو شانی داوەتە بەر خوێندنی ئایینیو بە فەقێیەتی لە زاخۆ و دهۆکو ئامێدیو شوێنانی دیکەی گەڕاوە.

لە ساڵی (١٩٣٦)ز ئیجازەی مەلایەتی پێدراوە. لە گوندەکانی (شێروان مەزن)و (بارزان)و لەناو (عەشیرەتی هەرکی) دەرسی داوە. گەلێك کاری میری کردووە. لەسەر هەڵویستی سیاسی گیراوە، لە ساڵی(١٩٤٦)ز دەستگیرکراوە بۆ ماوەی بیستو دوو مانگ دەخرێتە بەندیخانەوە، یەکێك بووە لە ڕەوشنبیرو ڕوناکبیرە کوردانەی کە پشتەڤانو هاریکاری شۆڕشی (١٤)ی تەموزی ساڵی(١٩٥٨)ز یان کردووە. ئەندامی یەکێتیی ئەدیبانی عیراق بووە. دەیان

گوتارو نووسینی لەسەر ئەدەبو مێژووی کورد بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی نووسیوە. لە ساڵی(١٩٥٩)ز لەگەڵ وەفدێکی میللی بە سەردان چۆتە (چینی میللی)و لەوێ گوتارێکی بە نرخی لەسەر ڕۆشنبیریو مێژووی کوردان پێشکەشکردووە. گەلێك هۆزانو گوتاری لەسەر ئەدەبو نەتەوەی کورد بڵاوکردۆتەوە، لە ڕۆژی (٢٢)ی حوزەیرانی ساڵی(١٩٦٢)ز لە شۆڕشی بەڕەڤانی لە بوونی نەتەوەی کورد شەهید دەکرێو دەچێتە ڕیزی نەمرانەوە.

## پرسا من ژ خودێ

خوداوەندێ پاكو سەخیو میهرەبان
دلۆڤانی، هەردەم ژ بۆمە هەمان
هەموو كار، بدەستێ تەنە بێ شكە
چ فەرمان بكەی دێ ببیت بێ ڤەمان
دزانم دگەل كەس تە نینە چو كین
دزانم ژ بۆ هەر كەسەك توی خودان
هەمی دنیا ئەڤرۆ تە كریە مرۆڤ
ژ بۆ هەر كەسێ تە كری یار، زەمان
ژ بۆ هەر كەسێ تە كری دۆست فەلەك
ژ بلی مە كوردان نەما بێ شڤان
نێ ئەم ژ سەپانو بەندێت تەنە
مە هشیار كە یا خودێ مەزن ژ خەوان
چ گونەهـ هەیە مە خودایێ بلند
چ سووچ مە هەیە ئەی خودا، دابزان
مەبینە ل سەر ڕێكەكا ڕاستو ڕوهن
ژ پشتامە باڤێ ڤی بارێ گران
تۆ ئازا بكە ڤی وەلاتی كمێد
بكێشە دەری وی، دەست تاسبان

(لەسەرەتاوە سێ دێڕ بۆ ئەزبەركردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

دلۆڤانی : تۆ بەرەحمی، بە بەزەیی

ژ بۆمە هەمان : بۆ هەمووومان، بۆ مەهەمیا

بێ ڤەمان : بێ مانەوە، بێ وەستان

چوکین : هیچ کینەو بوغزێك

تەکریە : تۆ کردووتە بە.

مەهشیار کە : هوشیارمان کەوە

یاخودێ من : ئەی خودای گەورە

چ گوننەهـ هەیەمە : ئایا ئێمە هیچ گوناحێکمان هەیە

ڕوهن : ڕوون

ژ پشتامە باڤێ بارێ گران: ئەو بارە گرانەمان لە کۆڵ کەوە

بێ شکە : بێ گومانە

ژ بلی : بێجگە لە

شڤان : شوان

نێ ئەم : بەڵام ئێمە

یا خودێ مەزن : ئەی خودای گەورە

مەبینە : بمانهێنە

ژ پشتامە باڤێ : لەسەرمان لابیە، لە کۆڵمان بکەوە.

تۆرەڤان : ئەدیب

